

# شۆڕشی خوێندکارانی ٦٨

شوان ئەحمەد کردویەتی بە کوردی

چاپی دووەم

کتێب: شۆڕشی خوێندکاران 68
بابەت: فەلسەفی
وەرگێڕانی: شوان ئەحمەد
نەخشەساز: شۆڕش ئەحمەد
بەرگ: سەیوان سەعیدیان
چاپخانە: کارۆ
چاپی دووەم- 2013
ژمارەی سپاردن (1309) ساڵی (2010)
نرخ (        )

# پێڕست

## سەرەتا

سالی 1968 لەسەدەی بیستەمدا سالێکی ئاسایی نەبوو، ئاسایی نەبوونیشی لەو جوڵەو بزوتن‌و راپەڕین‌و خۆپیشاندانانەدا بوو کەدواتر بووەمایەی دروستکردنی گۆڕانکاری جەوهەری لەئاستە جیاجیاکانی ژیاندا. پێشەنگی ئەو بزوتنەوە گرنگەی ئەو قۆناغە، توێژی گەنجان‌و خوێندکاران بوون کەتوانیان لەدژی نۆرم‌و بەهاکانی نەوەی پێش خۆیان راپەڕن‌و داوای هێنانە ئارای دنیایەکی نوێ بکەن، دنیایەک کەوەک لەدرووشمەکانیاندا داوایاندەکرد: (چێژی ژیانی تێدابکەن‌و قەدەغەکردنی تێدا قەدەغەبکرێت).

ئەمڕۆ چل‌و پێنج سال بەسەر ئەو رووداوە گرنگەدا تێدەپەڕێت، وەلی بەدرێژایی ئەو مێژووە کتێبخانەی کوردی لەتاکە سەرچاوەیەکی تایبەت بەو رووداوو پرسە گرنگەی

مێژووی ئەوروپا بێبەش بووە. ئەگەرچی باس‌و لێکۆڵینەوەو وتارگەلێکی زۆروو زەبەن لەسەر مێژووی رووداوەکەو دەرەنجامە گرنگ‌و کاریگەریەکانی نووسراون، بەڵام خوێنەرانی ئێمە بەزمانی کوردی لەهیچ یەک لەو سەرچاوانە بەهرەمەند نەبوون‌و لێی بێبەش بوون. ئەم هەوڵە بچووکەی ئێمە، بەو مەبەستەیە کەخوێنەری کوردو (بەتایبەتیش توێژی گەنجان‌و خوێندکاران)، کەم تاکورتێک لەو رووداوە گرنگەی مێژووی خۆرئاوا ئاگاداربن‌و رەگ‌و ریشەو رەهەندە جیاجیاکانی ببینین.

ئەم کتێبە لەچەند وتاروو لێکۆڵینەوەیەکی فیکری جیاجیا پێکدێت، کەهەریەکەیان لایەنێکی رووداوەکانی ئایاری 68 بەسەر دەکەنەوەو رۆشنایی دەخەنە سەر رەهەندێکی بزوتنەوەکە. بەو ئومێدەی کتێبەکە بەگشتی سوودێک بەخوێنەرانی کورد زمان بگەیەنێت‌و کەلێنێک لەکتێبخانەی کوردیدا بگرێت.

سەروەختی ئایاری 1968، فەرەنسا وڵاتێکی کۆنی کشتوکاڵیی بوو کە بە شێوەیەکی زۆر خێرا، بەرەو وڵاتێکی پیشەسازیی دەچوو. هەروەها ئیمپراتۆریەتێکی کۆلۆنیالی کۆن بوو کە هێندە نەبوو بە حەسرەتەوە جەزائیری لەدەست دابوو، سەرەڕای ئەوەش سوپاکەی لە شکستی ساڵی 1940 هەڵنەستابووەوە. دوو هێزی گەورە لە هەوڵی ئەوەدا بوون ئەو شکستو نوچدانانە لەبیر فەرەنسیەکان بەرنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش هەریەکەیان لە هەوڵی دروستکردنی ئەفسانەیەکی قارەمانانەدا بوون بۆ قەرەبووکردنەوە: یەکەمیان شکۆدارکردنی نەتەوە لەلایەن دیگۆلیەکانەوە، دووەمیشیان گۆرانی گوتن بە باڵای داهاتودا لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە. هەرچەندە ئەو ئایدیۆلۆژیایانەی ستایشی هەوڵو بەرخودانو سەرفرازییان دەکرد، توانیان دڵی نەوە تێکشکاوەکەی سەردەمی شەڕ بدەنەوە، بەڵام بۆ نەوەی دوای شەڕ مانایەکی ئەوتۆی نەبوو. ئەو نەوەیەی خواستو ویستی تری هەبوو، جیاواز لە ستایشکردنو شکۆبەخشین بە سستمی باوکسالاری.

وەك هەموو هەژانو رووداوێکی گەورەی مێژوویی، شۆڕشی ئایاری 68 لە پڕێکدا روویدا، لەبەرئەوەی کەس چاوەڕێی

شتێکی وای نەدەکرد، یان بە واتایەکی دی کەس مەزەندەی نەدەکرد ئەو ناڕەزاییە کۆمەڵایەتیە کەڵەکەبووە، دەرگا بە رووی ڕاپەڕینێکدا بکاتەوە کە هۆکارەکانی لە ڕەتکردنەوەی سەرکوتکردن بەهەموو جۆرەکانیەوە سەرچاوە بگرێت، زیاد لەوەی خەباتکردن بێت لە دژی چەوساندنەوە.

کرێکارانو بەتایبەتیش گەنجان، بەرلەوەی داوای هەقدەستی باشترو هەلومەرجی گونجاوتری کار بکەن، لە دژی نۆرمو بەهاکانی کۆمەڵگە ڕاپەڕین. لەم هەلومەرجەشدا کرێکاران دەیانتوانی زیاتر لە خەباتی خوێندکاران حاڵی بنو هاوسۆز بن لەگەڵیاندا. کرێکاران دژی دەسەڵاتی ڕۆشنبیرە دەربارەکانو هێزەکانی ئاسایش بوونو ئەوانیش وەك لاوان، گیرۆدەی ئەو سستمە ئەخلاقیە بوون کە ئارەزووەکانی خەفە دەکردنو جۆرە سانسۆرێکی جنسی بەسەردا دەسەپاندن کە قابیلی قبوڵکردن نەبوو. لێرەوە سەیر نەبوو درووشمو بەیداخی سوور، تێکەڵ بە بەیداخی ڕەش بێت کە بەیداخی شەڕەو گوزارشتە لە ئەنارشیستیەتێکی چێژبەخش، ئەو ئانارشیستیەش نە باوەڕی هەیەو نە یاساو نە داوای کۆمەڵگەیەکی دی دەکات، بەڵکو خوازیاری زیاد لە کۆمەڵگەیەکە.

کرێکارانو خوێندکارانو بێکارانو هونەرمەندانو ژنانی ماڵ، هەر هەموویان دەرژێنە سەر شەقامەکان. ئەمەش جگە لە سەرەتا شتێکی تر نییە.. با لەسەر خەباتو لەسەر شۆڕش

بەردەوام بینو درێژە بدەین بە پشێوی‌و نائارامی. با سیاسەتمەدارە بەساڵاچووەکان (ڕاستڕەوەکان یان سۆسیالیستەکان) بێدەنگ بن، ئەمەش جگە لە سەرەتایەکو دەسپێکێکی نوێ شتێکی تر نییە.. دواجار دەتوانین بە خواستی خۆمان هەموو شتێ تێکو پێکدەینو هەموو شتێ وێرانکەینو پاشان قسە بکەین، تا پێیان بڵێین: (چیتان پێنەکردین). ئەمە سەرەتایەو لێرە بە دواوە ناوەستین، لەبەرئەوەی ڕاوەستان مردنەو دۆڕاندنی گرەوەکەیە، مردنی (لۆفیگارۆ)یە لای ئەوانو مردنی (لیکیپ)ە لای ئێمە.

ئەم چەپێنراوەی شۆڕش لە دوورەوە گەڕایەوە. دژایەتیکردنی تۆتالیتاریزم کەم تا زۆر لە ئارەدا بووە، بەڵام لە ئایاری 68 دەتەقێتەوەو خۆی بەیان دەکات. لە هەناوی بزاوتی مارکسیزم خۆشیدا ئاقارێکی ڕادیکالی لە دروستبووندا بوو، ڕاپەڕینەکانی بەرلینی ساڵی 1953و بەتایبەتیش هەنگاریاو پۆڵەندا لە ئۆکتۆبەری 1956، بوونە مایەی ئاوسەندنی ئەو ئاقارە. لە فەرەنسا گۆڤاری (ئەرگومێنت) کە جیابووەکانی پارتی کۆمۆنستی فەرەنسی دەریاندەکرد، بووە مایەی ئەوەی لە سەرەتای شەستەکانەوە گەشەسەندنو پەلو پۆ هاویشتنی ئەو ئاقارە مسۆگەرتر بکات. "ئێدگارد مۆران" بووە دینامۆی سەرەکی ئەم تەوژمەو لەگەڵ "هنری لۆفیڤەر"دا دەستیان بە کارکردن کرد. هەردووکیان لە بەشی کۆمەڵناسی زانکۆی نانت

وانە بێژبوون، ئەو زانکۆیەی بەهۆی کەسێکی وەك "دانیال کوهین بندت"ەوە، دەبێتە ویردی سەر زمانی خەڵك. "دانیال کوهین" لەگەڵ هاورێکانیدا ڕۆژی 22ی مارس کۆنترۆڵی زانکۆ دەکەنو دامەزراندنی بزوتنەوەی بەناوبانگی 22ی مارس ڕادەگەیەنن، ئەمەش بڵێسەی ئەو ئاگرە بوو کە هەموو لایەکی گرتەوە.

سەرباری ئەوەش ئەو پشێوی‌و نائارامیەی لە زستانی 67-68 دا بەشی ناوخۆیی خوێندکارانی زانکۆکانی گرتەوە، بە بیانوی ئەوەی سەردانکردن لە شەودا قەدەغەیە، کاریگەری لەسەر خوێندکاران جێهێشتو بەرهەمی بیریارانی وەك "ولیەم رایش"و "ئەریك فرۆم" کە پشت ئەستور بوون بە نووسینەکانی "فرۆید""و "مارکس"، سەرچاوەیەکی فیکری گەورەی خوێندکارە چەپڕەوەکان بوو. ئەمانە لەلایەن چەپە دۆگماتیستو تەقلیدیەکانەوە دژایەتیی دەکران.

لەلایەکی ترەوەو لەو سەردەمەو قۆناغەدا، "جۆرج لاباساد"ی ڕاوێژکاری فیدراسیۆنە خوێندکاریەکان لە زانکۆی سۆربۆن، پسپۆڕ بوو لە لێکشیتاڵکردنی بوونیادە بیرۆکراسیەکان، ئەو بوونیادە بیرۆکراسیانەی پێشتر "فرۆید" پێداگری دەکرد لەسەر ئەوەی، کەم تا زۆر سەرجەمیان بەشدارن لە ملکەچ پێکردنیمنداڵان بۆ باوکێکی ستەمکاروو خاوەن دەسەڵات، دواتریش تەماهیکردن لەگەڵکارەکتەری ئەو باوکەدا. هەرووەها

"جۆرج ئۆرێ"و "ڤلیکس گاتاری" له چارەسەرگەی (cour—cheverny Bordede) سەرقاڵی بەرهەم هێنانی گوتارێکی تیۆری و ئەزموونێکی نوێ بوون، دەربارەی ئەوانەی گرفتی ئەقڵیان هەیەو گەیشتنە ئەوەی کە دەسەڵات لە خەمی قووتکردنەوەی کۆسپ‌و بەربەستی زیاترو زۆرتردایە، لەپێناو پاراستنی ئەو سستمە پاتریاکیە دیسپۆتیزمیەدا. ئەم بەرە نوێیەی کاریان بۆ ئازادی دەکرد، هەوڵەکانیان لەگەڵ بەرهەمەکانی "میشێل فۆکۆ" لە (مێژووی دێوانەیی)و پزیشکە دەروونناسە نارازیەکانی بەریتانیای وەك "لانج"و "کۆپەر" کە زیاتر "سارتەر" بوو بووە سەرچاوەیان، بەتایبەت لە کتێبی (ڕەخنەی ئەقڵی دیالەکتیکی)دا، یەکیان دەگرتەوە.

ئەم هێرش‌و پەلامارە ئازادیخوازانەیە، لەودیو ئەو ستراتیژیەتە کۆنەی مارکسیزم — لینینیزمەوە دەستی پێکرد کە برووای بە خەباتی بەرەیی هەبوو، لە دژی دەسەڵاتی ناوەند کە مەبەست لێی دەوڵەت بوو. بۆ هێرشکردنە سەر سوپاو دادگاو پۆلیس، هیچ شەرم‌و عەیبەیەکی تێدا نییە کە سەرەتا بە پەلاماردانی دەسەڵاتە بچووکەکانی خێزان‌و قوتابخانەو نەخۆشخانە دەست پێبکەیت. بەرلەوەی شەڕ لەگەڵ هێزەکانی ئاسایشدا بکەیت، چاکتر وایە پۆلیسە نهێنیەکان لە مێشکی خۆتدا بکەیتە دەر.

وەك هەموو قۆناغێکی چارەنووسساز کە کۆن نایەوێت بمرێت‌و تازەش ناتوانێت لەدایك بێت، هونەرمەندان پێشبینی ئەو

گۆڕانکاریانەیان دەکرد کە بەڕێوەیە. لە کۆتایی شەستەکاندا سینەماکارە ڕەخنەگرەکانی وەك "گۆدارو ڕاسنای‌و ڕیفات"و سینەمای نوێی ئەمریکای لاتین، ئاگری شۆڕش‌و یاخی بوونیان خۆش دەکردو تەبەنی هەناسە ڕادیکالو یاخی گەریەکانی سووریالیزمیان دەکرد. لەلایەکی ترەوەو یەکێکی دی لە نیشانەکانی ئەو سەردەمو ڕۆژگارە، گەڕانەوەی "بۆ نوال"ی دوژمنی سەرسەختی ترادسیۆنو کۆنەخوازی بوو بۆ ئەوروپا، دوای مانەوەیەکی دوورو درێژ لە مەکسیك بەهۆی دژایەتیکردنی سەرسەختانەی لەگەڵ دەسەڵاتی "فرانکۆ"دا، بەمەش پردێکی پەیوەندی لەنێوان نەوەکاندا دروستکردەوەو هەموویان سەرباری جیاوازی نێوانیان لە رووی تەمەنو هەلومەرجی مێژووییەوە، سەرلەنوێ لە تووڕە بوونو ناڕازی بوونیاندا یەکیان گرتەوە. هاوکات "ئارچی چاپ"و "سۆنی ڕۆلینز"و "ئەلبێر ئیلەر"و نموونەکانیان وەك نەفرەت لێکراوێك، فویان بە سەکسفۆنەکانیاندا دەکرد، تا هاوارو فوغانی ڕەش پێستەکانی ناو گیتۆکانی (هارلم)و (واست)، بدەن بەگوێی جیهاندا. ئەمانە جۆش‌و خرۆشیان لە وشەکانی "مالکۆلم ئەیکس" وەردەگرت، بەتایبەت گۆرانی (انولد ایها الولید). ئەم گۆرانیەی هەزاران جار دەوترایەوەو دەنگدانەوەشی گەیشتە پایتەختەکانی ئەوروپای وەك: (پاریس‌و بەرلین‌و لەندەن‌و ڕۆما)، ئەمە بووە مایەی دنەدانی ئەو گەنجانەی تینووی

ئەوە بوون دنیای کۆن بڕووخێنن: (هاوڕێم ڕاکە، دنیای پیروو کەنفت بەدواتەوەیە). دوای ئەوە ساڵی 1967 بەدوای یەکدا سێ بۆمب تەقینەوە، (کۆمەڵگەی وێنە) لە نووسینی "ڤای دی بۆر"، لەگەڵ (توێژینەوەیەك دەربارەی شێوازی هەڵسوکەوت، بەتایبەت بۆ نەوەی نوێ) لە نووسینی "ڕاوڵ ڤلنجان"، لەگەڵ ڕۆژنامەی (لهوب) کە گەنجە تووڕەکانی شاری ستراسبۆرگ بڵاویان دەکردەوەو باسی لە بەشمەینەتی خوێندکارانو گەنجان دەکرد، لە رووی سیاسیو ئابووریو دەروونییو جنسیەوە.

لەو قۆناغەدا ڕەخنەیەکی توند ئاڕاستەی کەپیتالیزمو بلۆکی سۆسیالستی دەکراو گەنجان پێیان وابوو، ڕزگاربوون تەنها بە مانگرتنی سەرتاسەری دەبێت، دژ بە جیهانی شمەكو کاڵا، جیهانێك کە هەموو شتێکی تێدا دەکڕدرێتو دەفرۆشرێت. تەواوی ئایکۆنەکانی مۆدێرنە لە (ئۆتۆمۆبێلو سەلاجەو کاسێتو تەجیلو کتێبو گۆڤار و.. هتد)، بە بڕووای "جۆرج بیرێك"، نابێت بەرکاربهێنرێن، بەڵکو پێویستە بدزرێنو دەستبەجێش لەگەڵ دزینیاندا وردوخاش بکرێن.

لەگەڵ سەرەتای مانگی ئایاری 1968، لەناوجەرگەی کۆمەڵگەی فەرەنسیدا، مەشخەڵەکان هەڵکران. ئەو گەشەو بەرەو پێشچوونەی ویردی سەرزمانی ئایدیۆلۆژیستەکان بوو، جگە لە (مرۆڤی تاك ڕەهەند) هیچی دیکەی بەرهەم نەهێنا.

ئەو مرۆڤەی "هربرت مارکۆزە" ڕەخنەی ئاڕاستە کرد. "مارکۆزە" یەکێکە لە ناوە دیارەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، ئەو قوتابخانە فیکریەی دوای هاتنە سەر حوکمی "هتلەر"، لە ئەڵەمانیاوە روویانکردە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو لەوێ گیرسانەوە. لە وڵاتە دەوڵەمەندو پێشکەوتووەکاندا، دیکتاتۆریەتێکی نەرمو نیان شوێنی دیکتاتۆریەتی تۆقێنەرانەی فاشیزمو نازیزمی گرتەوە، لە جیهانی سێهەمیشدا دیکتاتۆریەتێکی توندوتیژ هاتە ئارا، ئەم دوو دیمەنەش تێکەڵ بەیەك بوون، واتە ژیان بوو بە سەرزەمینی قەیرانە کوشندەکان. وەك "مارکس" پێشبینی دەکرد، مردو جڵەوی زیندووی دەکرد.

لێرەوە ئیتر سەرووەختی وێرانکردنو تێکوپێکدانی ئەو دنیایە دەستی پێکرد، وەختی ئەوە هات خەڵکی بوێری بکەنو شۆڕش بەرپاکەن. ئەوە بوو ئایار هاتوو دیوارەکان گوڵیان گرت.

بەربەستەکان بشکێنن، چێژ لە ژیان ببینن.
بەبێ سەردەمو ڕۆژگارە مردووەکان، ژیان ئەزموون کەن.
بجوڵێو ژیان بگۆڕە.

ئەوە بوون دنیای کۆن بڕووخێنن: (هاوڕێم ڕاکە، دنیای پیروو کەنفت بەدواتەوەیە). دوای ئەوە ساڵی 1967 بەدوای یەکدا سێ بۆمب تەقینەوە، (کۆمەڵگەی وێنە) لە نووسینی "ڤای دی بۆر"، لەگەڵ (توێژینەوەیەك دەربارەی شێوازی هەڵسوکەوت، بەتایبەت بۆ نەوەی نوێ) لە نووسینی "ڕاوڵ ڤلنجان"، لەگەڵ ڕۆژنامەی (لهوب) کە گەنجە تووڕەکانی شاری ستراسبۆرگ بڵاویان دەکردەوەو باسی لە بەشمەینەتی خوێندکارانو گەنجان دەکرد، لە رووی سیاسیو ئابووریو دەروونییو جنسیەوە.

لەو قۆناغەدا ڕەخنەیەکی توند ئاڕاستەی کەپیتالیزمو بلۆکی سۆسیالستی دەکراو گەنجان پێیان وابوو، ڕزگاربوون تەنها بە مانگرتنی سەرتاسەری دەبێت، دژ بە جیهانی شمەكو کاڵا، جیهانێك کە هەموو شتێکی تێدا دەکڕدرێتو دەفرۆشرێت. تەواوی ئایکۆنەکانی مۆدێرنە لە (ئۆتۆمۆبێلو سەلاجەو کاسێتو تەجیلو کتێبو گۆڤار و.. هتد)، بە بڕووای "جۆرج بیرێك"، نابێت بەرکاربهێنرێن، بەڵکو پێویستە بدزرێنو دەستبەجێش لەگەڵ دزینیاندا وردوخاش بکرێن.

لەگەڵ سەرەتای مانگی ئایاری 1968، لەناوجەرگەی کۆمەڵگەی فەرەنسیدا، مەشخەڵەکان هەڵکران. ئەو گەشەو بەرەو پێشچوونەی ویردی سەرزمانی ئایدیۆلۆژیستەکان بوو، جگە لە (مرۆڤی تاك ڕەهەند) هیچی دیکەی بەرهەم نەهێنا.

ئەو مرۆڤەی "هربرت مارکوزە" ڕەخنەی ئاراستە کرد. "مارکوزە" یەکێکە لە ناوە دیارەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت. ئەو قوتابخانە فیکریەی دوای هاتنە سەر حوکمی "هتلەر"، لە ئەڵەمانیاوە رووبانکردە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو لەوێ گیرسانەوە. لە وڵاتە دەوڵەمەندو پێشکەوتووەکاندا، دیکتاتۆریەتێکی نەرمو نیان شوێنی دیکتاتۆریەتی تۆقێنەرانەی فاشیزمو نازیزمی گرتەوە، لە جیهانی سێهەمیشدا دیکتاتۆریەتێکی توندوتیژ هاتە ئارا، ئەم دوو دیمەنەش تێکەڵ بەیەك بوون، واتە ژیان بوو بە سەرزەمینی قەبرانە کوشندەکان. وەك "مارکس" پێشبینی دەکرد، مردو جڵەوی زیندووی دەکرد.

لێرەوە ئیتر سەرووەختی وێرانکردنو تێکوپێکدانی ئەو دنیایە دەستی پێکرد. وەختی ئەوە هات خەڵکی بوێری بکەنو شۆڕش بەرپاکەن. ئەوە بوو ئاشار هاتوو دیوارەکان گوڵیان گرت.

بەربەستەکان بشکێنن، چێژ لە ژیان ببینن.

بەبێ سەردەمو ڕۆژگارە مردووەکان، ژیان ئەزموون کەن.

بجوڵێو ژیان بگۆڕە.

1968 ساڵی لە دایك بوون بوو، بەڵام شۆڕش هەر لە کۆتاییەکانی جەنگی دووەمی جیهانیەوە،لە هەناوی کۆمەڵگاکانی خۆرئاوادا تاوی دەسەندو گەورە دەبوو. هەموو ئەو مەرگ‌و ماڵوێرانیەی شەڕ لە دوای خۆی جێیهێشتبوو، لەگەڵ دابەشبوونی ئەورووپا بەسەر دوو کەمپی دژبەیەکداو ئەو جەنگە ساردەی لەو دابەشبوونە کەوتەوە، گەنجانو خوێندکارانی ناچار کرد بە ورووژاندنی پرسیار گەلێك، لە گرنگترینیان ئەمانە بوو: (ئایا تا ئێستاش دەسەڵاتدارانو پارێزەرانی ئەو سستمە باشو بەکەڵکن؟ ئایا بەڵگەی پێویستیان نیشان نەدا کە ئەوانە بە ڕێگای ڕاستمانِدا نابەن؟).

گەنجان بوون بە پێشەنگی یاخی بوون، لەبەرئەوەی نەوەی باوکان ماندووبوو بوونو بڕستیان لەبەر بڕابوو. یەکەمین ئاماژەکانی شۆڕش لە کایەی ئەدەبو هونەردا دیاری داو، ڕابەرانیشی هەر گەنجان بوون. ساڵی 1957 "جۆن ئۆزبۆن" شانۆگەری (Look back in anger) - (بە تووڕەیی ئاوڕ لە رابردووی خۆت بدەرەوە)ی نووسی، ئەم ناونیشانە تەعبیرە لەو ڕۆحیەتەی کە شانۆگەریەکەی

پێنووسراوە. پاشان لە بەریتانیا بزاوتێکی ئەدەبی دروستبوو کە ئەندامەکانی ناویان لە خۆیان نا ( Angry young men – گەنجانی توڕە). هەروەها یاخی بوون لە دژی شێوازە باوەکان، لە شانۆو شیعرو مۆسیقا لە ئەورووپاو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەستی پێکرد. سەرەنجام لەناو گەنجاندا ئایدیۆلۆژیایەك دروست بووو کە ئایتڵەکەی ئەمە بوو: (شۆڕش بەسەر پایەکانی ئەو ڕژێمە سیاسیەی باڵا دەست بوو، یاخی بوون لە مۆراڵی باوو بەزاندنی هەموو تخوویەکان).

لەم سەرووبەندەدا هەر بە تەنها سستمی خۆرئاواو ئایدیۆلۆژیای سەرمایەداری نەبوونە جێگەی ڕەخنە، بەڵکو ئەو ڕەخنانە حوکمڕانی ستالینیشی گرتەوە. واتە شۆڕشگێرە سونەکار کەوتنە گومانکردن لە بنەماکانی تیۆریای مارکسی کە پێشبینی بەرپابوونی شۆڕشی پرۆلیتاریاو داڕمانی سستمی سەرمایەداری دەکرد. بەڵام سەرەڕای تێپەڕبوونی سەدەیەك بەسەر دروستبوونی چینێکی پرۆلیتاری بەهێز لە ئەورووپا. شتێکی لەو جۆرە رووی نەدا.

لێرەوە گەنجان ڕوویان بە هیچ شتێکی سەردەمەکەیان نەماو ئەو ئەلتەرناتیڤەش کە هەبوو. شوێن باوەڕ نەبوو. کەواتە دەبێت چی بکرێت؟

فەیلەسوفە نوێیەکان وەك "هربرت مارکۆزە"ی ئەڵەمانی کەبوو بە باوکی رووحی بزاوتە خوێندکاریەکان، لە هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەدا بوو. ئەو پێیوابوو پرۆلیتاریا ئەو هێزە فریاد ڕەسە نەماوەو سەرمایەداری توانیویەتی لە ڕێی دروستکردنی پێداویستی وەهمی بەرخۆرییەوەو هەوڵدان بۆ تێرکردنی ئەو پێداویستیانە، چینی کرێکاران دەستەمۆ بکات. بەم پێیە ڕۆڵی ڕێبەرایەتیکردنی شۆڕش لە کرێکارانەوە، گواستراوەتەوە بۆ خوێندکارانو هێزە پەراوێز کەوتووەکانی ناو کۆمەڵگە، چونکە ئەمانە تا ئێستا سستمی سەرمایەداری نەیتوانیووە ناچاریان بکات بەوەی ملکەچی یاساکانی بن.

خەسڵەتی ئانارشیستانەی بزاوتی خوێندکاران لێرەوە سەرچاوە دەگرێت، بزاوتێك کە زۆر دوور بوو لەو دیسپلینەی تایبەتمەندی ئایدیۆلۆژیای مارکسیزمی تەقلیدی بوو. خوێندکاران لە شۆڕشەکەیاندا تێکو پێکدانی پایەکانی سستمی باڵادەستیان کردبووە ئامانج، هەر لە دەسەڵاتی سیاسیەوە بۆ نۆرمو بەها ئەخلاقیەکانیو یاساو دامو دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی. شۆڕشی خوێندکاران داوای ئازادی سێکسی دەکرد، لە دەرەوەی دەزگای خێزانو ژیانی هاوسەرگیری. بڵاوبوونەوەی کلتوری نەهێشتنی منداڵ بوون، یارمەتی دەربوو بۆ خۆپارێزی لە دەرەنجامە

نیگەتیفەکانی ئەو ئازادیە. گەنجە تورەکانی ئەو قۆناغە، پشتیان لە بیروو باوەڕی داموو دەزگا ئایینیەکان کردو لە بری ئاسمانو ئەوە دنیا، کەوتنە سۆراخکردنی بەختەوەری لەسەر زەمین. ئەوەی لەم پرۆسەیەشدا یارمەتیدەریان بوو، ئازادی جنسیو بەنگ کێشانو ئەو ئایدیۆلۆژیایە بوو کە بڕوای بە شکاندنی هەموو تخوبە ئەخلاقیو تەقلیدیەکان هەبوو.

گەرمەی ئەم کێشمە کێشو ڕاچەنینە لە ناو فەرەنسادا بوو، دواتریش ڕۆحی شۆڕش گەیشتە زانکۆکانی ئەمریکاو دژایەتیکردنی شەڕی ڤێتنام، تەکانی زیاتری بە بزوتنەوەی خوێندکاری دا. هەرووەها ئەورووپای خۆرهەڵاتیشی گرتەوەو بەهاری پراگ دروست بوو.

شۆڕشی خوێندکارانی 68 لە فەرەنسا، بەزنجیرەیەك مانگرتن لە زانکۆکانو خوێندنگا ئامادەییەکاندا دەستی پێکرد. حکومەتەکەی "شارل دیگۆل" هەوڵیدا بە شێوازی پۆلیسی سەرکوتی بکاتو ڕێگەی پێبگرێت. ئەمەش بووە مایەی هەڵایسانی شەڕوو پێکدادان لە شەقامەکانی (الحي اللاتيني)دا (کە بە گەڕەکی خوێندکاران دەناسرێت لە پاریس).

لەگەڵ مانگرتنی خوێندکاراندا، کرێکارانیش دایەنە پاڵیان تاوای لێهات لە ماوەیەکی کەمدا، ژمارەی

مانگرتوان گەیشتە دە ملیۆن کەس. حکومەتی فەرەنسا لەوەدا بوو بکەوێت، بەڵام هەرووەك چۆن هەلومەرجەکە لە پڕێکداو بەخێرایی تەقیەوە، هەرووەاش بەخێرایی دامرکایەوە. کرێکاران گەڕانەوە سەر کارەکانیانو سەرووەختێکیش هەڵبژاردنی تازە دەستی پێکرد (لە مانگی حوزەیران)دا، دیگۆلییەکان زیاد لە جاران بەهێز تربوون. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بزاوتی خوێندکاران نەیتوانی حکومەت ناچار بکات جەنگی ڤێتنام کۆتایی پێبهێنێت، هەرووەها لە ئەورووپای خۆرهەڵاتیش بزوتنەوەکە شکستی هێنا لەوەی سستمی سۆسیالستی ناچار بکات لە پراگ چاکسازی بکات، بە تایبەت دوای ئەوەی تانکەکانی پەیمانی وارشۆ خۆیانکرد بەو شارە قەشەنگەدا. لە وڵاتانی ئێمەشدا جۆشو خرۆش بۆ پرانسیپەکانی شۆڕشی خوێندکاری، نەگەشتە ئەوەی بگاتە ئاستی بزوتنەوەیەکی ڕادیکال، بەڵکو تەنها هەندێك ئاقاری دەستەبژێری ڕادیکالی لە زانکۆ دەستەبژێرەکانی وەك زانکۆی ئەمریکی لە بەیرووتو هەندێ بیریارو ڕۆشنبیری چەپڕەو، تەبەنییان کرد.

ئێستاو دوای تێپەڕبوونی چل ساڵ بەسەر شۆڕشی خوێندکاریدا، با بزانین چی لە پرانسیپەکانی ماوەتەوەو ئەکتیڤیستو چالاکوانەکانی بە کوێ گەیشتن؟

هەرچی پەیوەندی بە پرانسیپەکانەوە هەیە، ئەوا دارمانی سستمی سۆسیالستی لە ساڵی 1990دا، زۆرێك لە هاوکێشەکانی ژێرەو ژوورکردو بووە مایەی کەنارگیرکردنی چەپی جیهانی‌و کۆمەڵگاکانی دنیا ڕوویانکردە بەرخۆری (بەرخۆری وەك یەکێك لە خەسڵەتەکانی کۆمەڵگەی سەرمایەداری کە ئامانجی شۆڕشی خوێندکاریی بوو)، هەروەها گۆڕانو کێشەکانی دنیا بە تایبەت ئەو کێشانەی تایبەتی‌و شەخسی نین، جێ بایەخی گەنجانو خوێندکاری زانکۆ کان نین.

سەبارەت بە چالاکوانو ئەکتیڤیستەکانی بزوتنەوەکەش، ئەوا بە سێ ئاراستەی جیادا ڕۆیشتن:

-هەندێکیان گەڕانەوەیان بۆ باوەشی سستمەکە هەڵبژارد، وەك شۆڕشگێڕو بیریاری فەرەنسی "ڕێجی دۆبرێ" کە لە جەنگەڵەکانی ئەمریکای لاتینەوە گەڕایەوە بۆ پاریس، تاببێتە ڕاوێژکاری "فرانسوا میتێران". لەگەڵ "دانییال کوهن بندیت" "دانییە سوور" کە یەکێك بوو لە ڕێبەرانی شۆڕشی خوێندکارانی پاریسو بوو بە سەرمایەدارێکی خاوەن پلەو پایە، تا گەیشتە پەرلەمانی ئەوروپی.

- هەندێکی دیکەیان تا ئێستاش بڕوایان بەو پرانسیپانە ماوە، وەك بیرمەندی بەریتانی "تاریق عەلی"و ئەکتەری بەریتانی خاتوو "ڤانیسا ریدگریف" کە تا هەنووکە بە

گیانی ئەو بیرووبۆچوونانەی شەستەکانەوە، درێژە بە کارو چالاکیی سیاسیی خۆی دەدا.

- هەندێکی کەشیان (کە ئەمانەیان زۆرینەن)، دووچاری نا ئومێدییەکی قووڵ هاتنو خۆیان لە بەردەم دۆخێکی نەخوازراودا بینییەوە. ئەمانە لەوانەن کە هیچ ئینتیمایەکیان بۆ مۆراڵو دامو دەزگاکانی ئەو سستمە نەماوە، لەبەرئەوە لە پەراوێزدا دەژینو نایانەوێت ملکەچی یاساکانی ئەو سستمە بنو ببنە ئامرازی بەرهەم هێنان کە بەشداری لە پتەوکردنی پایەکانیدا دەکەن، بۆیە بوونەتە دانیشتوانی سەر شۆستەکان.

سێ ساڵ بەر لە ئێستا بەرێکەوت، چاوم بە یەکێك لەوانە کەوت کە لەبەردەم کۆگاکانی "هاروودز"دا شتێکی ڕاخستبوو لەوێدا دانیشتبوو. بەڵێ ئەو شوێنەی دیاری کردبوو بۆ ئۆقرە گرتن کە دەوڵەمەندەکانی شارەکە رووی تێدەکەن. تۆ بڵێی مەبەستی لەمە چی بێت؟ بۆ بەو جلو بەرگە دڕاوو سەروو قژە چڵکنەوە، لە ناو ئەو خەڵکە شیك پۆشو بۆن خۆشانەدا دادەنیشێت؟

لەگەڵ ئەوەشدا، نە لە کەس پاڕایەوەو نە بەزەیی کەسیشی بەلای خۆیدا ڕاکێشا. "مارك" نموونەی ئەو کەسانەیە کە سەر شۆستەکان دەکەنە ماڵی خۆیان. کاتێك سەیری دەکەیت هەست دەکەیت لە بەرامبەر کەسێکدای،

لەوانەیە شەڕێکی دۆڕاندبێت، بەڵام هەرگیز دەستبەرداری شکۆمەندی خۆی نەبووەو بە یەکجاری ئاڵای سپی هەڵنەکردووە.

لەمێژووی خۆرئاواو جیهاندا، ساڵی 1968 بەساڵێکی چارەنووسسازو پڕ رووداو ئەژماردەکرێت. بۆنموونە، لەو ساڵەدا "مارتن لۆتەر کینگ" "رۆبێرت کەنەدی" تیرۆرکرانو وڵاتی چیکۆسلۆڤاکیا لەدژی هەژمونی یەکیەتی سۆڤیەت راپەڕیو بەهاری پراگ روویدا. هاوکات بزوتنەوەی فێمێنستی لەخۆرئاوا سەریهەڵداو، سەرەتای کۆتایی هاتنی یەکیەتی سۆڤیەتیش بەدەرکەوت. لەگەڵ ئەوانەشدا، بزوتنەوەیەکی کرێکاریی و خوێندکاریی بەناوبانگ سەریهەڵداو دەسەڵاتی حکومەتەکەی "شارل دیگۆل"ی لەفەرەنسا هەژاند.

شۆڕشیی خوێندکارانی 1968 بەڕادەیەك بوو، لەناخەوەو لەهەموو روویەکەوە: (دەروونیی، کلتوریی، سێکسوالیتی، ئازادی، سیاسی، فەلسەفی)، ژیانی کۆمەڵگەی فەرەنسی گۆڕی. بەر لەپاریس، باهۆزی شۆڕشو راپەڕین لە پایتەختو زانکۆکانی دیکە ئەوروپادا هەڵیکردبوو، هەرلە رۆماوە بۆ بەرلینو لەندەنو مەدرید، بەڵام تەنها لەپاریسدا تاوی سەندو ژەنراڵ "دیگۆل"ی سەرۆکی فەرەنسای

ناچارکرد بۆماوەیەکی کاتی فەرەنسا جێبهێڵێت. پاش ئەوەی نەیتوانی راپەڕینەکە کۆنترۆڵ بکات.

شۆڕشیی ئایاری 68 لەجەوهەریدا شۆڕشێك بوو دژی کۆمەڵگەو تەقالیدە کۆنەکانی، دژی دەسەڵاتو شکۆی باوك لەخێزانداو دژی خاوەنکار لەکارگەداو دژی مامۆستایان لەخوێندنگاکانداو..هتد. لەراستیدا سستمی پەروەردە لەتەواوی ئەوروپادا، نەیدەتوانی جێگای ئەو هەموو خوێندکارە بکاتەوە کەروویاندەکردە خوێندنگاو زانکۆکان، پەیڕەوو پرۆگرامەکانی زانکۆیەکی وەك سۆربۆنیش، ماوەی نیوسەدە بوو هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتبوو.

خوێندکاران هەر بەتەنها رەخنەیان لە زانکۆو سستمی پەروەردەو فێرکردن نەگرت، بەڵکو کەوتنە رەخنەگرتن لەتەواوی کۆمەڵگە. لەبەرئەوەی دەسەڵات دەستەو ستان بوو لەچاکسازیکردنی کۆمەڵگە، خوێندکاران جگە لەشۆڕشکردن هیچ چارەیەکی دیکەیان نەمابوو بۆ گۆڕانکاریی.. شایەنی باسە خوێندکاران خوازیاری ئەوەبوون چەپڕەوەکان دەسەڵات بگرنە دەست، بەتایبەت چەپڕەوە توندەڕەوەکانی وەك "ماوتسی تۆنگ، هۆشی منە، گیڤاراو گروپەکەی ترۆتسکیو .. هتد". گەنجانی فەرەنسا بەمە تەعیبریان لەمەیلێکی منداڵانە دەکرد،

مەیلێکی هەرزەکارانە لەرووی سیاسیەوە، بەڵام پڕی بوو لە پاکێتیو حەزکردن بەئازادی. گەنجان لەو شۆڕشەدا درووشمەکەی "رامبۆ" ی شاعیریان بەرزکردبووەوە کەدەڵێت: (پێویستە ژیان بگۆڕێت، ئەو ژیانە بێتامو تەقیلدییە بۆئێمە ناگونجێت.. ئاخر ئێمە ژیانێکی دیکەمان دەوێت).

"هنری ویبەر" مامۆستای زانستە سیاسیەکان دەربارەی شۆڕشیی 68 دەڵێت: (ئەو شتەی لەمارکسیزمدا جێگا سەرنجی خوێندکاران بوو، ئەو ڕەهەندی گۆڕانو مژدەدان بەئایندەیە بوو کە لە مارکسیزمدا هەبوو.. خوێندکارانی ئەو سەردەمە پێیان وابوو، کۆمەڵگە بەتەواوەتی گەندەڵ بووەو ئومێدی چاکبوونی لێناکرێت، بۆیە دەبێت تێکوپێکی بدەن بۆئەوەی لەجێگایدا کۆمەڵگەیەکی تازەترو ئینسانی تر دامەزرێنن).

تێکوپێکدانی کۆمەڵگەش تەنها لەرێگای شۆڕشێکی سەرتاسەریەوە بوو، ئەوەبوو لەئایاری 68دا دەستیان پێکردو دڵنیابوون تەواوی سستمە راستڕەوەکانی ئەورووپا رادەماڵێت. رابەرانی بزوتنەوەی خوێندکاران پێیان وابوو، سەندیکاکانی کرێکاران دەتوانن بەشۆڕشیی چینایەتی هەستنو پێشبینیەکەی "مارکس" بێننەدی، چونکە بەبۆچوونی "مارکس" کرێکاران ئامرازی گۆڕانکاریەکانن.. بێگومان وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئامانجی تەواوی ناڕەزاییو

یاخی بوونی خوێندکاران بوو، چونکە ئەمریکا سەرەنێزەی سەرمایەداری بوو لە جیهانداو جەنگێکی چەپەڵیشی لەڤێتنامدا بەڕێوە دەبرد، کەواتە دوژمنی گەلانەو پێویستە نرخێو باجی ئەو کارانەی بدات. بەمجۆرە یاخی بوونی خوێندکاران گەیشتە بیرکلیو چەند زانکۆیەکی دیکەی ئەمریکاو یابان، ئیتر بڵێسەی شۆڕش سەرجەم وڵاتانی جیهانی گرتەوە.

لەفەرەنسا پاش ئەوەی خوێندکارانی زانکۆی سۆربۆن، کەوتنە ئەنجامدانی کاری ئیستیفزازیو لەگەڵ هێزی پۆلیسدا دایان بەیەکداو ژمارەیەك لەهەردوولا بریندار بوون، لەپای ئەمەدا هێزەکانی پۆلیس بڕیاری دەستگیرکردنی سەرانی بزوتنەوە خوێندکاریەکەیاندا کەبەدەیان کەس دەبوون. ئەم کارەی پۆلیس خوێندکارانی توڕەترکرد، بۆیە لەزانکۆی نانتێر کۆبوونەوەو "دانیال کوهێن بندت" وتارێکی بۆدانو پێی وتن: (ئێرە بەدواوە بەگژ پۆلیسدا دەچینەوەو لەسەرکوتکردنی هاوڕێکانمان بێدەنگ نابین). خوێندکاران کردیانە چەپڵەڕێزان، لەبەرئەوەی ئەو سەرکردایەتی ڕاپەڕینەکەی دەکرد.

ڕۆشنبیرە گەورەکانی فەرەنسا پشتیوانی بزوتنەوەی خوێندکارانو کرێکاران بوون.. "ژان پۆل سارتەر" یەکێك بوو لەوانە کەهاتە سەرشەقامەکانو بەیاننامەی بۆ

پشتیوانیکردنی خوێندکارانو دژایەتیکردنی دەسەڵات، بڵاودەکردەوە. پۆلیس بۆماوەیەکی کەم "سارتەر" یان دەستگیرکرد، بەڵام هەرزوو ئازادیان کرد، چونکە "شارل دیگۆل"ی سەرۆکی فەرەنسا پێیوتن: (کێ دەتوانێت ڤۆڵتێری ئەم سەردەمە دەستگیربکات.. خێرا ئازادی بکەن). لەراستیدا گرتنی "سارتەر" هەڵەیەکی کوشندەبوو، لەبەرئەوەی کەسێکی زۆر بەناوبانگ بوو، هاوکات بۆحکومەتیش ناوبانگ زڕاندن بوو.

دوابەدوای "سارتەر"، هەریەك لەفەیلەسوفانی وەك: "میشێل فۆکۆو "ژێل دولۆزو ئیڤی مۆنتان"و دەیان نووسەروو هونەرمەند، رژانە سەر شەقامەکان. لەم سەروبەندەدا ئاژاوەیەکی گەورە لەنێوان راستڕەوەکانو چەپڕەوەکانی فەرەنسادا دروستبوو، هێندەشی نەمابوو شەڕێکی قورس لەنێوان خوێندکارانی سەربە بەرەی چەپو بەرەی راستتدا بەزنجیروو تێلا بقەومێت. گەر پۆلیس رێگیری نەکردایە، ئەوا بەسەدان کەس دەکوژرانو بریندارەبوون.. سەرەڕای رێگری پۆلیسیش، بەڵام توندو تیژی زۆر روویداو خوێنێکی زۆر رژا تەنانەت داروو درەختی شەقامە قەشەنگەکانی پاریسیش شکێنرانەوە.

بەکورتیەکەی بەهــاری ساڵی 1968ی پاریس، زۆرجوانو قەشەنگو گەرمو گوڕبوو.. خوێندکاران دوای

ئەوەی سەرکەوتنی گەورەیان بەدەست هێنا، وەکی قارەمانێك پێشوازیان لە"دانیال بندت کوهین"کرد، چونکە ئەوزانی چۆن تەحەدای پۆلیس بکاتو گوێ بەهەڕەشەو گوڕەشەکانیان نەدات.. لەوکاتەوە ناوی "کوهین" بووە ناوێکی درەوشاوەو وەك ئەفسانەیەکی لێهات، بەڵام هەنوکە بۆتە پیاوێکی ئاقڵو سەنگینو وەکو سەرکردەی ئاژاوەچیو یاخیبوان نەماوەتەوە.. ئێستا ئەندامێکی بەناوبانگی پەرلەمانی ئەورووپییە، تەنانەت بەشداری لە دەرکردنی بڕیارە سیاسیەکاندا دەکاتو لەگەڵ گەورە کەسایەتیەکانی ئەورووپاشدا کۆدەبێتەوە.

چل ساڵ بەرلەئێستا "کۆهین" ئاژاوەچیو کەسێکی سەربەگۆبەن بوو. لەسەرووەختی شۆڕشیی 1968 پۆلیس هەڵی کوتایە سەرماڵەکەیو دەستگیریانکردو بۆماوەی هەشت سەعات بەبەردەوامی، کەوتنە لێپێچینەوە لەگەڵیدا. راستڕەوەکانی فەرەنسا رقێکی زۆریان لێی بوو، ئەویان بەبەرپرسی ئاژاوەگێڕی دەزانی. لەرۆژی 2/ ئایاری/1968دا یەکێك لەراستڕەوەکانی فەرەنسا لەگۆڤاری حیزبەکەیاندا نووسیبووی: (پێویستە چارەیەك بۆئەم مرۆڤە بەدفەڕە بدۆزینەوە کەبۆتەمایەی پشێویو ئاژاوە بۆفەرەنسا، دەبێت دەست بەجێ لەولاتەکەماندا دەری کەین.

ئەگەر دەسەڵات ئەم کارەنەکات، ئەوا بەناچاری گەنجەکانمان بیرازی دەکەنو لەناوی دەبەن).

دوای هەشت هەفتە لەتوندوتیژیو پشێوی زۆر، فەرەنسا پشوویەکیداو ژەنەراڵ "دیگۆڵ" پاش ئەوەی بۆماوەی چەند رۆژێك هەڵهات، گەڕایەوە پاریس. ئەو ماوەیەی "دیگۆڵ" لەوڵاتدا نەبوو، سەرەك وەزیرانەکەی "جۆرج بۆمبیدۆ" بەوپەڕی هێزو سەرسەختیەوە بەرپرسیارییێتی گرتە ئەستۆ. وەك چۆن هەموو شۆڕشەکان کۆتاییان دێت، شۆڕشی 1968 کۆتایی هات، بەڵام لەپاش خۆی نائومێدیو حەسرەتێکی زۆری جێهێشت. لەبەرئەوەی نەیتوانی سستمی حوکمڕانی راستڕەوەکان بڕووخێنێت، ئەگەرچی توانی کۆماری پێنجەمو سەرکردەکەی بگەیەنێتە سەر لێواری لەناوچوون.

وەکی عادەت دوای هەموو پشێویو ئاژاوەیەك، خەڵك پێویستی بەهێمنیو دیسپلین هەیە، هەربۆیە دوای ئەو رووداوانە، گەلی فەرەنسا بەرێژەیەکی زۆر دەنگیاندا بە "دیگۆل"و حیزبەکەی. بەمجۆرە سەرلەنوێ دیگۆلییەکان دەستیانگرتەوە بەسەر پەرلەمانو دەسەڵاتدا. پاش ئەوەی بەهۆی شۆڕشیی خوێندکارانەوە خەریك بوو وڵات لەکۆنترۆڵیاندا نەمێنێت، دیگۆلییەکان توانیان جارێکی تر بەهێزێکی زۆرەوە بێنەوە مەیدانو حوکمڕانی وڵات بکەن.

لەپای ئەم ڕووداوانەدا زۆرێك لەمێژوو نووسان دەیانپرسی:
(چۆن فەرەنسا خۆی تەسلیمی ئاشوبەو شۆڕشکرد،
لەکاتێکدا خۆشترین ساتەکانی ژیانی خۆی دەگوزەراندا؟
ئەم هەموو وێرانکاریو تێکدانە بۆ، لەکاتێکدا وڵات
هەلومەرجێکی ئابووری باشی هەبوو، هەرووەها
سەرکردەیەکی مێژوویی وەك شارل دیگۆل حوکمڕانی
دەکرد؟ تۆبڵێی فەرەنسیەکان شێت بووبن؟). شایەتی باسە
لەوکاتەدا "فرانسوا میتێران" هەوڵیدا ئەو هەلە بقۆزێتەوەو
خۆی وەکی ئەلتەرناتیڤی دەسەڵات نیشاندات، بەڵام ئەم
کارەی بەخراپ بەسەردا شکایەوەو سوودێکی ئەوتۆی
لێنەبینی، چونکە وەها دەرکەوت کەسێکی هەلپەرست بێتو
بیەوێت ئەو قەیرانە بقۆزێتەوە، بۆئەوەی بگاتە دەسەڵات.
شۆڕشی 1968 تەواوی چاودێرانی سەرسامکرد،
لەبەرئەوەی فەرەنسا وڵاتێکی دیموکراسی بوو، هەرووەها
سەندیکای کرێکارانیش لەکارکردنو ڕێپێواندا ئازاد بوون.
هاوکات تۆپۆزسیۆنە چەپڕەوەکان بۆیان هەبوو لەپەرلەماندا
بەویستی خۆیان، ڕەخنە لەسیاسەتەکانی حکومەت بگرن،
بەڵام ئەی بۆچی باروودۆخەکە وای لێهاتو ئەو پشێویو
کاری تێکدەرانەیە بۆ ڕوویدا؟ بۆچی شۆڕشیی خوێندکاران
لەزانکۆکانی بێرکلیو تۆکیۆو ڕۆماو مەدرید، بەئاسانی
تێپەڕیو تەنها لە فەرەنسادا بووبە شۆڕشێکی

سەرتارسەری‌و هەڕەشەیەك لەسەر سستمی حوکمڕانی لەو وڵاتەدا؟

تائێستاش مێژوونووسان پرسیار لەنهێنی شۆڕشیی ئایاری 1968 دەکەن لەفەرەنسا.. هەندێك دەڵێن: (فەرەنسا وڵاتی شۆڕشیی فەرەنسیەو شتێکی ئاسایشە ناوبەناو شۆڕشیی تێدا روویدات).. هەندێکی دیکە دەڵێن: (کۆمەڵگەی فەرەنسی لەوقۆناغەدا پێویستی بەتەکانێکی گەورە هەبوو، بۆئەوەی خۆی تازەبکاتەوەو لەو چەقبەستن‌و نەبزۆکیە بێتەدەر). لەو بەهارە قەشەنگەدا، گەنجان پێویستیان بەوە هەبوو خۆیان بسەلمێنن.. دادپەروەری کۆمەڵایەتیش بەوئاستە لەئارەدانەبوو، وەکی ئەوەی لایەنگرانی دەسەڵات باسیاندەکرد، لەبەرئەوەی کەلێنێکی گەورە لەنێوان چینی پرۆلیتاریاو سەرمایەدارەکاندا هەبوو.

شایانی باسە خوێندکاران‌و رۆشنبیران پشتیان بەچینی کرێکاران قایم بوو، چونکە پێیان وابوو چینێکی شۆڕشگێڕەو کار بۆ ئەوە دەکات سستمی حوکمڕانی بگۆڕێت‌و سەرووەت‌و سامانی وڵاتیش بەیەکسانی بەسەر میللەتەدا بەشبکات، لەوەشدا بەهەڵەدا چووبوون کەدەیانزانی پارتی کۆمۆنیست‌و سەندیکاکان تاکۆتایی لەگەڵیاندا دەڕۆن‌و رژێم دەگۆڕن. حیزبی کۆمۆنیست حساباتی خۆی هەبوو، دواجار نەیوێرا شۆڕشێکی سەتارسەری لەدژی

"شارل دیگۆل" راگەیەنێت. لەراستیدا رەوشی ژیانو گوزەرانی چینی کرێکاران بەرەو باشی دەچوو، لەبەرئەوە حیزبی کۆمۆنیست نەیدەویست لەبەرچاوی کاڵی خوێندکاران، ئەو دەسکەوتە کۆمەڵایەتیانە بکاتە قوربانیو لەدەستیان بدات.

لەنێوان هەرزەکاری سیاسیو بەرپرسیارێتی سیاسیدا، جیاوازی هەیە. یەکێك لەو بیریارانەی لەسەردەمی رووداوەکانی شۆڕشیی 1968 ژیاوە، پێیوایە: (شۆڕشیی 68 لەیەك کاتتدا هەم نوێ بوو هەم کۆنو بەسەرچووش بوو. نوێ بوو لەبەرئەوەی زەمینەسازی کرد بۆسەدەی بیستو یەك، بەرلەهاتنی. کۆنیش بوو لەبەرئەوەی بڕووای بەدرووشمە شۆڕشگێڕیەکان هەبوو، بەشێوە مارکسیو ماویو ... هتد).

دوای شۆڕشیی 68 دەسەڵاتدارانی فەرەنسا چەندین ریفۆرمیان لەکۆمەڵگەدا کرد، ئەمەش دەریدەخات ئەگەرچی شۆڕش نەیتوانی دەسەڵات بگۆڕێت، بەڵام هەوڵەکانیشی بەهەدەر نەچوون. هاوکات دوای ئەو شۆڕشە، حەقیقەتی مارکسیزم بەدەرکەوتو مێژوو پێشینەکانی "مارکس"ی دەربارەی هەرەسی سەرمایەداریو جێگرتنەوەی لەلایەن پرۆلیتاریاوە، بەدرۆخستەوە. لەراستیدا سەرمایەداری زانی چۆن خۆی لەگەڵ واقعی تازەدا بگونجێنێتو چۆن

چۆنیش ژیانێکی بەرخۆری دەخاتە بەردەست کرێکارانو رازییان دەکات، بەجۆرێك وایان لێبکات دەست بەرداری خەونی شۆڕشگێڕی خۆیان ببن. مەسەلەکە هەرواش بوو. هێندەی نەبرد چینی ناوەند لەکۆمەڵگەی فەرەنسیدا دەوڵەمەندبوو. هەرووەها بارودۆخی ژیانی چینی کرێکاران باشتربوو، تاوای لێهات کرێکاری فەرەنسی بووە خاوەنی ماڵو سەیارەو سەرجەم ئامرازەکانی ژیانی بەرخۆری نوێ.. ئیتر کەواتە مسیۆ "کارل مارکس"، ئەوانە شۆڕش بۆچی بکەن؟

بەڵێ جارێکی دی سەرمایەداری سەلماندی ژیرەو دەزانێت چۆن هەڵسو کەوت دەکات، بۆئەوەی بەر بەناڕەزایی کۆمەڵایەتی بگرێتو هێوریان بکاتەوە. گەر وانەبوایە پێشبینیەکەی "مارکس" دەهاتە دیو سەرمایەداریش لەناودەچوو. سەبارەت بە سستمی خوێندن لەزانکۆو پڕۆگرامی پەروەردەو ژیانی رۆشنبیری، بەشێوەیەکی گشتی شۆڕشیی 68 کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر جێهێشتن. ئەوەبوو سستمی زانکۆکانی فەرەنسا نوێکرانەوەو ئاقارگەلێکی فیکری نوێ لەدایکبوو، بەتایبەت ئاقاری بوونیادگەریو "رۆلان بارت" کۆنترۆڵی کایەی رەخنەی ئەدەبی کرد. لەبواری فەلسەفەدا "میشێل فۆکۆ"و "ژێل دولۆز" پەیدابوون، لەئەنسرۆپۆلۆژیادا "کلۆد

لیڤی شتراوس"و لەبواری سۆسیۆلۆژیاشدا "پیر بۆردیۆ" بەدەرکەوتو لەبیسکیۆلۆژیادا "ژاك لاكان"و هتد. لەپای ئەم گۆڕانکاریانەشدا، ئەستێرەی بەختی "ژان پۆل سارتەر" دای لەکزی.

فەڕەنسیەکان لەم رووژانەدا (ئەم وتارە لە 11ئایاری-2008 دانووسراوە و.کوردی)، بۆیادی شۆڕشی ئایاری 1968 ئاهەنگ دەگێڕن، دوای ئەوەی چل ساڵی تەواوی بەسەردا تێپەڕی. خوێنەری ئێمە بونەوەی لەڕەهەندەکانی ئەم رووداوە گەورەیە تێبگات کەپێگەی دەسەڵاتی ژەنەڕاڵ "دییگۆڵ"ی لەقکردو ناچاری کرد کۆشکی ئەلیزێ جێبهێڵێت، بەرەو شوێنێکی نادیاروو بوماوەی چلو هەشت سەعات لەبەر چاو ون بێت، بەبێ ئەوەی تەنانەت سەرۆك وەزیرانیش بزانێت لەکوێیە، پێویستە هەندێ زانیاری سەرەتایی بەردەست بخەین.

بە پێچەوانەوەی ئێستاوە، ئەوەی لەو سەردەمەدا لە زانکۆکانی فەڕەنساو تەنانەت زانکۆکانی ئەورووپاو ئەمریکای باشوریشدا باڵادەست بوو، تەوژمی چەپو چەپگەرایی ڕادیکاڵانە بوو. وەك چۆن ئێستا فێندەمێنتالیزمی ڕاستڕەوانە یاخود گەڕانەوە بۆ دواوە لە ئارادایە، ئەوا لەو سەردەمەدا بیرووبۆچوونی "چێ گیڤار"و "مارکسیستەکان" کە هەردووکیان دژی ئیمپریالیزمی ئەمریکاو سستمی سەرمایەداری بوون، کاریگەروو باڵادەست بوون.

فەرەنسیەکان لەم رووژانەدا (ئەم وتارە لە 11ئایاری-2008 دانووسراوە و.کوردی)، بۆیادی شۆڕشی ئایاری 1968 ئاهەنگ دەگێڕن، دوای ئەوەی چل ساڵی تەواوی بەسەردا تێپەڕی. خوێنەری ئێمە بوئەوەی لەڕەهەندەکانی ئەم رووداوە گەورەیە تێبگات کەپێگەی دەسەڵاتی ژەنەڕاڵ "دییگۆڵ"ی لەقکردو ناچاری کرد کۆشکی ئەلیزێ جێبهێلێت، بەرەو شوێنێکی نادیاروو بوماوەی چلو هەشت سەعات لەبەر چاو ون بێت، بەبێ ئەوەی تەنانەت سەرەك وەزیرانیش بزانێت لەکوێیە، پێویستە هەندێ زانیاری سەرەتایی بەردەست بخەین.

بە پێچەوانەوەی ئێستاوە، ئەوەی لەو سەردەمەدا لە زانکۆکانی فەڕەنساو تەنانەت زانکۆکانی ئەورووپاو ئەمریکای باشوریشدا باڵادەست بوو، تەوژمی چەپو چەپگەرایی ڕادیکاڵانە بوو. وەك چۆن ئێستا فێندەمێنتالیزمی ڕاستڕەوانە یاخود گەڕانەوە بۆ دواوە لە ئارادایە، ئەوا لەو سەردەمەدا بیرووبۆچوونی "چێ گیڤار"و "مارکسیستەکان" کە هەردووکیان دژی ئیمپریالیزمی ئەمریکاو سستمی سەرمایەداری بوون، کاریگەروو باڵادەست بوون.

لەو ڕۆژانەدا ئەوەی باوی بوو، تێزو بیروو بۆچوونەکانی "ژان پۆڵ سارتەر"و "هێربرت مارکۆزە"و "ژێلا دولۆز"و "میشێل فۆکۆ" بوو. نابێ لێرەشدا ناوی تیۆرسینە سەرەکیەکانی سۆسیال دیموکراتەکانی وەك: "ئەدگار مۆرانو کۆرنیلۆس کاسترۆ یادیسو کلۆد لیفۆر"مان لە یاد بچێت، تێکڕای ئەمانە نەیاری کۆلۆنیالیزمو کەمپی خۆرئاوای سەرمایەداریو لایەنگری کێشەکانی جیهانی سێیەم بوون. کەواتە جیاوازییەکی گەورە لە نێوان سیاقی چل ساڵا لەمەوبەرو ئێستادا هەیە. هـــەنووکە گەلی فەرەنسا بەراورد بە ساڵی 1968، بایداوەتەوە بەلای ڕاستدا. گەر وا نەبوایە "سارکوزی" سەرنەدەکەوتوو، هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لە کاندیدای چەپڕەوەکان "سیگولین ڕۆیاڵ"ی نەدەبردەوە.

چاودێران کۆکن لەسەر ئەوەی کۆمەڵگای فەڕەنسی تا ساتە وەختی شۆڕشیی 68، لەرووی مۆڕاڵو سێکسو پۆلێتیکەوە، کۆمەڵگایەکی زۆر کۆنسێرڤاتیف بووە. هاوکات سەرمایەداریی فەڕەنسی، سەرباری ئەو سەرکەوتنو دەستکەوتانەی لەسەردەمی "شارل دیگۆل"دا بە دەستی هێنابوو، بەلام هەر هێزێکی زۆر زاڵم بوو، واتە بەرژەوەندی چینی زەحمەتکێشو کرێکارانو جوتیارانو خوێندکارانی فەرامۆش کردبوو.

لەبەرئەوە ڕاپەڕینی بەهاری ئەو ساڵە واتە (ئایاری 1968)، بە بزاوتێکی نارەزایی توندی خوێندکاران دەستی پێکرد، کەدواتر بووە مایەی خستنە جوڵەی کرێکارانو ئەمەش مانگرتنێکی سەرتاسەری لێکەوتەوە کە فەرەنسای ئیفلیجکرد. کارێك کە بووە مایەی دروستکردنی قەیرانێکی سیاسی گەورە لەو وڵاتەدا. ئەم حاڵەتە لە هیچ وڵاتێکی دیکەی خۆرئاوا ڕوونەدا، ئەگەرچی خۆپیشاندانی خوێندکاران لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئەڵەمانیای خۆرئاوا (ئەو کات هێشتا ئەڵەمانیایەکی نەگرتبووەو بەسەر خۆرهەڵاتو خۆرئاوادا بەش بوو بوو)، بەخۆپیشاندانی خوێندکارانی فەرەنسا دەچوو. شۆڕشیی خوێندکاران تەنها لە فەرەنسا سیمای شۆڕێشکی گەوردو سەرتاسەری وەرگرت.

ئەڵبەتە هۆکار گەلێکی قووڵو سەرەکی هەبوون کەبوونە مایەی ئەو شۆڕشەی، پایەکانی سستمی حکومڕانی لە فەرەنسادا لەقاند. لێرەدا نموونەیەکی بچووك باس دەکەین. بەشی زۆری کورسی خوێندنی زانکۆو پەیمانگا باڵاکان، بۆ ئەو خوێندکارانە بوو کە سەر بەچینە دەوڵەمەندو خواپێداوەکانی کۆمەڵگەی فەرەنسی بوون، بەشێکی کەمیشی بۆ ئەو خوێندکارانە بوو کە سەر بەچینی ناوەندو چینی کرێکاروو جوتیاران بوون. هاوکات زانکۆکان بێبەش بوون لە شوێنی خوێندنی گونجاوو هۆڵی پێویست. زانکۆکان بەجۆرێك

تەنگەلان بوون (قەڵەباڵغ) بوون، زۆرێك خوێندكاران شوێنی دانیشتنیان دەست نەدەكەوت‌و نەیاندەتوانی وەكی پێویست ئامادەی وانەكانی خوێندن بن. زانكۆكان كۆن‌و فەرامۆشكراو بوون. دەوڵەت زۆرترین پارەی بۆ ئەو خوێندنگە باڵایانە سەرف دەكرد كە منداڵی بنەماڵەو خوا پێداوەكانی تێدا پەروەردە دەكرا، تا ببنە كادێری دەوڵەت‌و كاروباروو دام‌ودەزگاكان بەڕێوەبەرن.

بەڵێ سستمی خوێندن بەردەوام حەزی بە منداڵی دەوڵەمەندو خێزانە پارەداروو بۆرژوازیەكان بوو، وەكی ئەوەی "پییر بۆردیۆ" لە كتێبەكەیدا (میراتگران) باسی دەكات. ئەوانەی هەژاری‌و بەدبەختیان وەك میراتی بۆ جێدەمێنێت، جیاوازن لەوانەی سەرووەت‌و سامان‌و ژیانێكی پڕ عەیش‌و نۆشیان بەنسیب دەبێت. خاڵی دەسپێك لە ژیاندا وەك یەك نیە بۆ هەموو كەسێك. لێرەوە ئەوانەی لەو سەردەم‌و زەمانەدا بە ئاسانی دەردەچوون‌و بڕوانەمای بەرزیان بەدەست دەهێنا، زۆربەی زۆریان سەر بەچینی بۆرژوا باڵادەست‌و خوا پێداوەكان بوون. ئەوانە ئەو ئیلیت‌و دەستە بژێرانە بوون كەلە باوانییەوە كاروباری وڵاتیان بەڕێوە دەبرد، وەكی ئەوەی پرۆسەكە ویراسی بێت‌و بۆیان مابێتەوە.

بۆ نموونە بواری دیبلۆماتی فەڕەنساو باڵوێزان‌و گەورە فەرمانبەران‌و بەڕێوەبەری كۆمپانیاكان‌و...هتد، بەشی زۆری

تەرخان کرابوو بۆ منداڵانی بنەماڵە بۆرژوازو دەست ڕۆشتووەکان. واتە جێگەی منداڵی خواپێداوەکانی تێدا دەبووەوەو کوڕی جوتیاروو کرێکاریش بۆی نەبوو خەون بەپلەی و پایەی بەرزەوە ببینێت. هەرلەو قۆناغەدا بارووددۆخی ژیانی کرێکاران بەرەو خراپی دەچوو، مووچەکانیان لەبری ئەوەی زیاد بکات کەمی کرد.

"دانیال کوهین بندیت " یەکێك لە ڕێبەرانی شۆڕشیی خوێندکاری 1968 لە فەرەنسا، دەڵێت: (هەنوکە کەس ناتوانێت مەزەندەی ئەوە بکات کە خوێندنگەو کارگەکانی ئەوسای فەرەنسا بەچی دەچوون. کارگەکان بە مەخفەری سەربازی دەچوونو ڕێگە بە سەندیکا کرێکاریەکان نەدەدرا لقی خۆیان لە ناویاندا بکەنەوە، لەترسی ئەوەی نەك کرێکاران بەگژ خاوەن کارەکاندا بچنەوە، چونکە خاوەن کارەکان وەك کۆیلە مامەڵیان لەگەڵا کرێکاراندا دەکرد، بەتایبەت کرێکارانی بیانی).

شۆڕشیی ئایاری 68 چەندە توانی ئاسۆیەکی تازە بەرووی کۆمەڵگەی فەرەنسیدا بکاتەوە؟

شۆڕشیی ئایاری 68 بزاوتێکی یۆنیڤێرسالی جیهانی بوو، لەئەڵمانیاوە بۆ فەرەنساو لەوێشەوە بۆ ئەمریکای باکوروو مەکسیکۆو تۆکیۆو بەرازیل.لەهەموو جێگەیەك لاوان تینوی ئازادی بوون. لەگەڵ ئەو شۆڕشەشدا شنەبای ئازادی لەهەموو لایەکەوە، بەسەر دنیادا هەڵیکرد.

لەلایەکی ترەوە "دانیال کۆهین بندیت " لەدرێژەی قسەکانیدا دەڵێت: (لاوان لەهەموو شوێنێك دەیانویست خۆیان جڵەوی ژیان بکەنو ئاراستەی ژیان دیاری بکەن، ئیتر ئەمە لەکارگەکان بێت یان لەزانکۆ یاخود لەژیانی تایبەتی خۆیاندا.. حەزی ئازادی ئەو کات لەلوتکەدابوو.. درووشمەکانمان لەو دەمەدا سووریالیانەو شاعیرانە بوو، دەمانووت: داوای مەحاڵ بکەن! یان: بۆرژوازیەت یەك ئامانجی هەیە، ئەویش ئەوەیە هەرچی حەزو ئارەزووە لەناوی بەرێت).

ئازادی لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتیو ئابووریو ڕۆشنبیری سنووردار بوو، لەرووی ئازادی تاکەکەسیشەوە، ئەوە هەر زۆر کەم بوو. ڕەنگە ئێمە کە دوای 68 هاتوینەتە ئەوروپاو بەو شارستانیەتە سەرسامین، ئەمەمان بەلاوە سەیر بێت. بالێرەدا لەسەر مەسەلەی ئازادییە فەردییەکان نموونەیەکی بچووکتان بۆ باس بکەم لەکۆمەڵگەی فەرەنسیدا، کەڕەنگە ئەمڕۆ کەس باوەڕی پێنەکات، چونکە ئێستا ئەو وڵاتە پڕیەتی لە ئازادی تاکە کەسیو جنسی.

ئایا ئێمە ئەوە دەزانین کە بەشی ناوخۆیی خوێندکارە کوڕەکانی زانکۆ، بەر لە شۆڕشیی 68 لەبەشی ناوخۆیی کچان جیابوو؟ مەحاڵ بوو هیچ خوێندکارێکی کوڕ پێبنێتە بەشی ناوخۆیی کچانەوە، یان سەردانی خۆشەویستەکەی بکات لە ژوورەکەیدا. گەر کارێکی وا رووی بدایە، ئەوا پاسەوانی

بەشەکە دەست بەجێ ئەو کەسەی دەردەکرد وەك ئەوەی گورگێك بێتو هاتبێت کچە جوانو قەشەنگەکانی ئەوێ بکاتە نێچیر. بەکورتیەکەی تێکەڵ بوون یاساغ بوو، چاودێریکردنو کۆنترۆڵیش لەو پەڕیدا بوو.

ئایا ئێمە ئەوە دەزانین کەبەر لەئایاری 68، ژن بۆی نەبوو حسابی تایبەت لە بانکەکاندا بکاتەوە، ئەگەر ڕەزامەندی مێردەکەی بە نووسراوێك پێنەبووایە؟ ڕەنگە ئەم شتانە بۆ ئەوەی ئەمرۆی کۆمەڵگای فەرەنسی باس بکەیت، باوەڕ نەکەنو بڵێن: (ناچێتە عەقڵەوە، بۆ ئێمە لە وولاتی تاڵیبان دەژین یان لە فەرەنساین؟). ئەی ئێمە ئەوە دەزانین کەخانم "دیگۆلا" ئەو خانمە فەرەنساییەکان لە خۆشەویستیدا پێیان دەووت "تانت ئیڤۆن"، دەیوت: (پێویستە کچان بەرلە سەعات هەشتی ئێوارە بچنەوەماڵەوە، ئەگەرنا لەکەدار دەبن). بەڵێ کۆمەڵگای فەرەنسی کۆمەڵگەیەکی تەقلیدیو کۆنسێرڤاتیڤانە بوو، بەدەست داخرانێکی مێژوویەوە دەیناڵاند کە دەگەڕایەوە بۆ سەدەی نۆزدە. ئەم داخرانەی سەرەنجام بووە مایەی ڕكو پەنگ خواردنەوەو دواتریش تەقینیەوە. بەم جۆرە شۆڕشو ڕاپەڕین ڕوودەدەن. لەپای ئەو بارودۆخەدا گەردەلوولی ئایاری 68 هەڵیکردو لەڕێگەشیدا هەرچی هەبوو ڕای ماڵی. لێرەوە کۆمەڵگەی کۆنو داخراو هەرەسی هێناو،

کۆمەڵگەیەکی مۆدێرن شوێنی گرتەوە کە لێوان لێوە لە ئازادییە تاکە کەسییەکانو تا ئەمڕۆکەش بەردەوامە.

ئێمە وەك ئەو خوێندکارانەی وڵاتانی جیهانی سێ کەلە دوای ساڵی 68 هاتینە فەڕەنسا، بەرلەهەر کەسێکی دی ئێمەو مانان سوودمەند بووین لەو ڕاپەڕینە مەزنە، لەبەر ئەوەی لەو ئازادیو فەزای کرانەوەیە بەهرەمەند بووین، کۆمەڵگایەکمان بینی کراوەیە بەرووی بیانیەکانداو قبووڵی جیاوازی دەکاتو کەمتر ڕاسیستانەیە.

من بۆ خۆم هەشت ساڵ دوای ئەو ڕووداوە بەمەبەستی خوێندن هاتمە فەڕەنسا، کەهاتم بیروبۆچوونی ئازادیو پێشکەوتنو تۆلێرانسو ڕۆشنگەریم نەك هەر لە زانکۆکاندا، بەڵکو لەهەموو جێو شوێنێکدا بینی. ئەو کاتەی من هاتم کێشەکانی جیهانی سێ لە ئارەدابوو. بیروو بۆچوونی بوونیادگەرو مارکسیستەکان، پاوانی کایەی ڕۆشنبیری فەڕەنسایان کردبوو. "ژان پۆڵ سارتەر"، تارماییە مەزنەکەی بەسەر فیکری فەڕەنسییەوە هەرمابوو. وەکی ئاشکرایە لەسەر وەختی شۆڕشیی 68دا لەشەقامی (سان جێرمان دوبرێ)، دەسگیر دەکرێتو سواری سەیارەی پۆلیس دەکرێت، بەڵام "شارل دیگۆڵ" دەست بەجێ فەرمانی ئازادکردنی دەردەکاتو دەڵێت: (کەس ناتوانێ ڤۆڵتێر زیندانی بکات!). ئەمە بەڵگەی مەزنی "دیگۆڵ"ە، وەك چۆن مەزنی "سارتەر"یش دەسەلمێنێت. ئەو

سەردەمە ناوی کەسانی وەك: "کلۆد لیڤی شتراوس‌و ڕۆلان بارتو ئالتۆسیرو جاك لاکان‌و میشێل فۆکۆو جیل دولۆزو جاك دێریداو پییەر بۆردیۆ"، دەزرنگایەوەو بیروو بۆ چوونەکانیان دژ بە ئیرۆ_سەنتەریزم‌و لەگەڵا داننان بە مافی کلتوری‌و ژیاریدا بوو. تەنانەت بەبۆچوونی من هەندێ جار ئەوەندە ئەم کارانەیان دەکرد لەلایەن فێندەمێنتالیستەکانەوە کەڵکی لێوەردەگیرا بۆ دژایەتیکردنی هەر جۆرە کرانەوەیەك بەسەر شارستانیەتی خۆرئاوادا.

ئەمتوانی برووا بەوەبکەم سەرووەختێك پێیان وتم: (لە- الحي اللاتيني- دا شەڕی دەستەویەخە بەتێلاو چەقۆ، لەنێوان خوێندکارە چەپڕەوو ڕاستڕەوەکاندا دروست دەبوو..). وەکو ئەوەی فەرەنسیاییەکان بەقەد پێویست مەدەنی‌و شارستانی نەبووبن، تاکێشەکانیان لەڕێی دیالۆگی دیموکراسیەوە یەکلایی بکەنەوە، نەك بەناسازبوونی یەکتری‌و بەشێوازی بەربەریانە. واتە ئەوانیش وەك ئێستای ئێمەوابوون. تەنانەت یەکەمین بڵێسەی نایاری 68، بەرەنجامی بڵاوبوونەوەی پڕووپاگەندەیەك بوو، گوایە فاشیەکان بەڕێوەن بۆئەوەی پەلاماری زانکۆی سۆربوون بدەن کەئەوکات مەڵبەندی چەپڕەوەکان بوو. فاشیەکانیش کوڕی ئەو بنەماڵە ڕاستڕەوانە بوون کەلەپەیمانگای زانستە سیاسیەکان لەشەقامی (ئەساس) دەیانخوێند، ئەوەی ئەم پەیمانگایەشی لەسۆربوون جیادەکردەوە،

تەنها پارکی قەشەنگی لوکسەمبۆرگ بوو. خوێندکارە چەپڕەوەکانی سۆربۆن بەبیستنی ئەو هەواڵە، کەوتنە شکاندنی کورسی‌و مێزەکان، تادارو تەختەکانی وەك چەکێك لەبەرامبەر هێرشبەراندان بەکاربهێنن!

بەمجۆرە شۆڕشیی 1968 دەستی پێکرد. دوای ئەوەی هێزەکانی پۆلیس چەند خوێندکارێکی زانکۆی (نانت) دەسگیردەکەن، لەبەرئەوەی خۆپیشاندانیان لەدژی جەنگی ڤێتنام سازداوەو وتاری دژبە ئیمپریالیزمی ئەمریکیان داوە، خوێندکارانی سۆربۆن لە (الحی اللاتینی) پشتیوانیان لێدەکەنو دەدەنە پاڵیان.

پاشان مەسەلەکە گەورەتر دەبێت تا لەکۆنترۆڵ دەردەچێت. لەم سەرووبەندەدا کرێکارانیش دەدەنە پاڵ بزوتنەوەکە. بەمجۆرە فەرەنسا گەورەترین مانگرتنی کرێکارانو خوێندکاران لەهەموو مێژووی ئەوروپادا بەخۆوە دەبینێت. سەرەنجام وڵات تووشی ئیفلیجیەکی تەواو دەبێت، تائەو ئاستەی "شارل دیگۆل" سەرەڕای مەزنی‌و هەیبەتی، بەراستی دەشڵەژێتو پەنادەباتە بەر "جاك ماسۆ"ی سەرکردەی هێزەکانی فەرەنسا لە (بادین) لەوڵاتی ئەڵمانیا، تالە دڵسۆزیی‌و وەلای سوپا دڵنیا بێت، بەرلەوەی بڕیاری قورس بدات.

"دیگۆل" دوای بەخەرجدانی رەنجێکی زۆر، توانی کۆنترۆڵی رەوشەکە بکات. ئەوپیاوەی لەجەنگی دووەمی

جیهانیدا بەرەو رووی زریانو گەردەلولی ئەو قۆناغە بووەو قەیرانی جەزائیری هاتەرێو سەرسەختانە تێپەڕاندن، کەراپەڕینی ئایاری 68 روویدا، سەرەتا نەیدەزانی چۆن چۆنی رووبەرووی ئەو قەیرانە ناوخۆییە بێتەوە، قەیرانێك هێندەی نەمابوو خۆیو تەواوی سستمی حوکمڕانیەکەی رامالێت. بەڵام پەندێك هەیە دەڵێت: (ئەو قەیرانەی نامکوژێت بەهێزترم دەکات). لە 68دا ئەمە روویدا.

فەرەنسا دوای ئەو قەیرانە ترسناکەی لەناخەوە هەژاندی، زۆربەهێزترو گەنجانەتر هەستایەوەو هاتەوە مەیدان. لایەنگرانی شۆڕشیی 68 پێیانوایە، گەورەترین باهۆزی ئازادی بووە لە سەردەمی مۆدێرندا، بەسەر فەرەنسادا هەڵیکردبێت (ئەڵبەت ئەگەر شۆڕشیی فەرەنسیمان حەلاوێرد کرد).

شۆڕشیی 68 بووە مایەی ئازادکردنی وزە چەپێنراو حەزو ئارەزووە سێکسیە سەرکوتکراوەکان، لەدەست ئەو مۆراڵە تەقلیدیەی میراتی رابردوو بوو.بەڵام کێشەکە ئەوەیەکە شۆڕشیی ئایاری 68 وەك هەر پەرچەکردارێکی دیکە، زیاد لەپێویست بەئاقاری پێچەوانەدا رۆیشت. بۆنموونە ئازادی جنسی نەدەزانرا تاکوێ دەرورواتو سنووری کوێیە. ئەمە وایکرد پەرچەکردارێك دژی ئایاری 68 دروست بێتو گەلانی فەرەنسا پیاوێکی راستڕەوی وەك "نیکۆلای سارکۆزی" هەڵبژێرن، کە

توانی ئەو گۆڕانەی بەسەر گەلی فەرەنسیدا هاتووە بۆخۆی بقۆزێتەوەو سەرکەوتنی پێ مسۆگەر بکات.

لەوتارە بەناوبانگەکەیدا کە بەماوەیەکی کەم بەر لەهەڵبژاردنی بۆ پۆستی سەرۆکایەتی فەرەنسا، لەبەردەم سەدان هەزار کەسو بەئامادەبوونی گەورە هونەرمەندانو کەسایەتیەکانی وڵاتدا پێشکەشیکرد، هێرشێکی توندی کردە سەر شۆڕشیی 68. لەو قسانەی لەوتارەدا هاتووە، دەڵێت : (میراتگرانی ئایاری 68 بیرۆکەیەکی پوچگەرایانەیان بەسەردا سەپاندین کەدەڵێت: هەموو شتێك وەکی یەکەو هیچ جیاوازییەك لەنێوان چاکەو خراپە، راستو هەڵە، جوانو ناشریندا نیە. لێرەوە سەرەکیترین پرسیارێك کەلەم هەڵبژاردنەدا بەرەو رووما ن دەبێتەوە ئەوەیە: ئایا میراتی ئایاری 68 دەپارێزین، یاخود لەرەگ‌و ریشەوە دەریدەهێنن!).

بەمجۆرە "سارکۆزی" دەنگی کاتۆلێك مەزهەبە تەقلیدیەکانو دیگۆلی‌و راستڕەوە پەڕگیرەکانی بردەوە، چونکە هەموو ئەمانە زۆر لەرۆحیەتی شۆڕشیی ئایاری 68 بێزاروو داخ لەدڵ بوون.لەگەڵ ئەوانەشدا "سارکوزی" دەنگی چەندین کەسی دیکەشی بۆخۆی مسۆگەر کرد کەلەئازادی زۆری جنسی ماندووبووبن، بەڵام ئاخۆ "سارکۆزی" کوڕی پیاوێکی کۆچبەری هەنگاری، دەگەیشتە پۆستی سەرکۆماری فەرەنسا، ئەگەر شۆڕشیی ئایاری 68و ئەو گۆڕانەی ئەم

شۆڕشە لەئەقڵیەتی فەرەنسیەکاندا دروستی کرد. نەبوایە؟ دەبووە سەرۆك، لەکاتێکدا نەك جارێك بگرە دووجار ژنی تەڵاقدراوە؟ چونکە وەکی دەزانین مەدام "دیگۆل" نەیدەهێشت "شارل دیگۆل"ی هاوسەری، هیچ کەسێك داوەتی سەرخوان بکات کەژنەکەی تەڵاقدابێت، تەنها کەسێك کەچاوپۆشی لێدەکرد، نووسەری بەناوبانگ و هاوڕێی نزیکی مێردەکەی "ئەندرێ مالرۆ" بوو. مەدام "دیگۆل" ئەمەی بۆیەدەکرد، چونکە خۆی خانمێکی کاتۆلیك مەزهەب بوو، لای کاتۆلیکەکانیش تەڵاقدان حەرامە. بەرهەحاڵ دوای ئەوە بەچەند رۆژێك "سیگۆلین رۆیاڵ" بەتوندی وەڵامی "سارکۆزی" دایەوە، بەڵام نەیتوانی راستڕەوەکانی لێهەڵبگێڕێتەوە.

"رۆیاڵ" لەبەردەم سەدان هەزار کەس و لەکۆبوونەوەیەکی جەماوەری گەورەدا وتی : (من نامەوێت بگەڕێمەوە بۆدۆخی بەر لەئایاری 68. نامەوێت بگەڕێمەوە بۆ دواوە، وەکی ئەوەی مسیۆ سارکۆزی دەیکات. من نامەوێت بگەڕێمەوە بۆ دۆخێك کەبووە مایەی تەقینەوەیەکی رادیکاڵی، ئەویش لەبەریەك هۆکاری سادەو ساکار، چونکە ئەوکات دەسەڵات نەیدەویست بەشێوەیەکی دادپەروەرانە سەرووەتو سامان بەسەر گەلی فەرەنسیدا دابەش بکات). هەر لەدرێژەی قسەکانیدا دەڵێت: (کەس ناتوانێت ئایاری 68 بسڕێتەوە، نەسارکوزی و نەکەسی

دیکەش. ئایاری 68 واتە یانزە ملیۆن مانگرتوو لەکاروو خۆپیشاندەر لە شەقامەکاندا، کەتوانیان دەسەڵات ناچار بکەن ملکەچی داواکارییەکانیان بێتو گوزەرانیان چاکتر بکات. هاوکات ئەوەشیان بەسەر کۆمەڵگەدا سەپاند تامافی ئەوە بەئافرەت بدات، منداڵ لەبارخۆی بەرێتو ئازادی تەواوی لەشوکردنو تەڵاق وەرگرتندا هەبێت). ئایاری 68 باهۆزی ئازادی بوو بەسەر کۆمەڵگەیەکی داخراودا هەڵیکرد، کۆمەڵگەیەك کەهەموو دەرگاکانی بەسەر خۆیدا داخستبوو.

بەمجۆرە دەبینین ئەو شەڕەی شۆڕشیی ئایاری 68 زەمینەی بۆخۆشکرد، دوای چڵ ساڵ لەدەست پێکردنی هێشتا هەر بەردەوامەو کۆتایی نەهاتووە، کۆتاییش نایەت مادامەکی چەوسێنەروو چەوساوە هەبێت. لێرەدا پێویستە سەرۆك "سارکۆزی" زیاد لەپێویست بەئارامی نەنوێتو چاوەکانی لێك نەنێت، چونکە ئەگەر هاتوو سیاسەتەکانی بنەمایەکیان نەبوو بۆچاککردنی هەلو مەرجی کۆمەڵایەتی ملیۆنەها فەرەنسایی هەژاروو نەدار، سەرباری ملیۆنەها کۆچبەری لەوان هەژارتروو دەست کورتتر، ئەوا ئایارێکی 68 دیکە سەر لەنوێ بەروویدا دەتەقێتەوە.

میللەتی فەرەنسا بەدرێژایی مێژوو، فێری کردووین کە میللەتی شۆڕشیی رزگاریخوازییە: هەر لەشۆڕشیی 1789 بۆشۆڕشیی بەهاری میللەتان ساڵی 1848، بۆشۆڕشیی

1871 کەبە کۆمۆنەی پاریس ناسراوەو "کارل مارکس بەیەکەمین شۆڕشیی پرۆلیتاری ناو مێژووی وەسف دەکات. بۆشۆڕشیی ئایاری 68، دەبینین لیستەکە دوورو درێژە پڕیەتی لەشۆڕشو راپەڕین.

دوا شت کە مابێت بۆئەوەی ئەم باسەمان هاوسەنگ و بێکەموکوڕی بێت ئەوەیە، لەدوا پەیوەندی تەلەفونی نێوان "شارل دیگۆل"و "جۆرج پۆمپیدۆ" ی سەرەك وەزیرانو لەگەرمەی رووداوەکانی ئایاری 68دا، "دیگۆل" بەرلەوەی تەلەفۆنەکە دابخات پێیدەڵێت: (ماچت دەکەم). "پۆمپیدۆ" سەیری بەم قسەیەی سەرۆك دێتو خەریکە باوەڕ بەوەنەکات کەگوێی لێبووە، چونکە "دیگۆل" لەژیانیدا بەو جۆرە تەعبیری لەهەستو سۆزی خۆی نەکردووە. ئەمەش گەورەترین بەڵگەی ئەوەیە کە "دیگۆل"بەهۆی قوڵبوونەوەی کێشەکانەوە، کۆنترۆڵی خۆی لەدەست داوەو نەیزانیووە چی دەکاتو چی دەڵێت. دواتر وەکی باسمانکرد بۆماوەی چلو هەشت سەعات ون دەبێت تا هەناسەیەك بداتو لەدڵسۆزیو وەلای سوپا دڵنیا بێت. هاوکات خۆی ساف بکات، بەرلەوەی بڕیاری چارەنووسساز بدات.

رۆژی بیستو نۆی ئایار بەدڵنیاییەوە گەڕایەوە گوندەکەی خۆیو بۆبەیانی رۆژی دوایی لەکۆشکی ئەلیزی، کۆبوونەوەیەکی بەئەنجومەنی وەزیران کرد، پاش ئەوە راستەوخۆ وتارێکی کورتو توندی ئاڕاستەی گەلی فەرەنساکرد.

لەوتارەکەیدا دەڵێت: (من خاوەنی مەشرووعیەتی نیشتمانیو جمهوریەتی باڵای فەرەنسامو لەژێر هیچ فشارێکدا دەست بەرداری نابم. لەهەلو مەرجێکی وادا لەژیانی سیاسی ناکشێمەوەو سەرەك وەزیران ناگۆڕم. ئەمڕۆ پەرلەمان هەڵدەوشێنمەوەو داوای سازدانی خولێکی تازەی هەڵبژاردنی پەرلەمان دەکەم لەسەرتاسەری وڵاتدا، بۆئەوەی میللەت خۆی ئەم قەیرانە چارەسەر بکات).

ئەم چەند قسەیە بەس بوون بۆئەوەی جارێکی دی، ئەو سەرکردە بەساڵاچووە کۆنترۆڵی ڕەوشەکە بکاتەوە. جەوهەری هەندێ پیاو لەکاتی هەڵکردنی زریانو گەردەلولدا دەردەکەوێت. "دیگۆل" بەزریانەکان ڕاهاتبوو، وەك هەموو سەرکردە مێژووییەکانیش، بەهەڵکردنی زریانو گەردەلولەکان گەشەی دەکرد. ئەو بەوەشاندنی گورزێکی گران کەتەنها لەدەست سەرکردە مەزنەکان دێت، توانی شۆڕش لەئاستی خۆیدا ڕابگرێتو تەنانەت ئەوەشی لەدەس هات کە لە ڕووی سیاسییەوە بەسەریدا زاڵ بێتو ئارامیو ئاسایش بۆ وڵات بگێڕێتەوە.

ئێوارەی ئەو ڕۆژەی "دیگۆل" وتارەکەی دا، دژە خۆپیشاندانێك لەشەقامی شانزلیزیدا دەستی پێکرد کە "ئەندرێ مالرۆ"و چەند سەرکردەیەکی دی لەریزی پێشەوەیدا بوونو هوتافیان بەناوی "دیگۆل" دەکێشا. میللەتی فەرەنسا جارێکی

دی وەفاو دڵسۆزی خۆی بۆ سەرکردە مێژووییەکەی دووپاتکردەوە، ئەو سەرکردە مێژووییەی دووجار لەماوەی جەنگی دووەمی جیهانیو سەروەختی شەڕی جەزائیردا رزگاری کرد، ئەویش بەپێدانی دەنگ بەلیستەکەی "دیگۆل" لەهەڵبژاردنە پەرلەمانیەکەی فەرەنسادا کە لەکۆی 485 کورسی 362 کورسی بەرکاندیداکانی ئەوان کەوت. بەمجۆرە گەل ئەو کێشەیەی لەبەرژەوەندی ژەنەراڵ "دیگۆل" یەکلایی کردەوە. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کەگەلی فەرەنسی ئاستی تێگەیشتنی چەند بەرزەو دەزانێت دواجار چۆن چۆنی خۆی لەکارەساتوماڵوێرانی لادەدات. ئەو میللەتە مانگێکی بەهاری بەدێوانەیی بەڕێکردو ئیتر بەسیەتی. پاشان دەسەڵاتیش زانی چۆن سازش دەکاتو مووچەی کرێکاران بەرێژەی لە 35% زیادەکات.

ئەمەو سەرەڕای چەندین سازشی تر بۆ خوێندکارانو ژنانو.. هتد. بەمجۆرە "فرانسوا میتێران"و "پییر مندیس"، جارێکی دی لەبەردەم سەرکردەیەکی مێژوویی وەك "شارل دیگول" خراپ تێکشکان. وەکی ئاشکرایە ئەو دوانە هەوڵیاندا ئەو پشێویەی وڵات بقۆزنەوەو کۆنترۆڵی دەسەڵات بکەن، بەتایبەت کەلە گەرمەی رووداوەکاندا بینیان خەریکە رەوشەکە لەدەست "دیگۆل" دەردەچێت.

بەم دوابیانە"دانیال کوهین بندیت " رایگەیاند: (ئیمە لەناباری 68دا لەرووی رۆشنبیری و کلتوریەوە سەرکەوتین، بەلام خۆشبەختانە لەرووی سیاسیەوە تێك شکاین. چۆن دەکرێت مەزەندەی ئەوە بکەین حزبی ئانارشیستو پووچگەراو ئاژاوەگێروو چەپە توندڕەوکان لەسەر کورسی حوکمڕانین؟ گەر ئەوە رووی بدایە، چی بەسەر فەرەنسادا دەهات. ئەو بەد مەستیە قەشەنگەی ئەو قۆناغە کۆتایی هاتو سیمای فەرەنسای گۆڕی).

ئەم مانگە (واتە مانگی ئایار) ، ڕێکەوتی یادی چل ساڵەی شۆڕشی خوێندکارانو لاوان دەکات کە ساڵی 1968 لە ئەوروپادا تەقیەوەو بۆ خۆم لە نزیکەوە ئاگاداری هەندێ لە ڕووداوەکانی بووم. ئەم شۆڕشە بریتی بوو لە بزاوتێکی نارەزایەتی نیشاندانو ڕەتکردنەوەو ڕەخنەی کۆمەڵایەتیو شێوازێك لە شێوازەکانی پرۆسەی گۆڕانو گۆڕینی کۆمەڵایەتیو کلتوری، خەسڵەتی سەرەکیشی بریتی بوو لە گەشەکردنی هۆشیاری خوێندکاری کە کەم تازۆر هاوشێوەی (هۆشیاری چینایەتی)یە لای کرێکاران لە سەدەی نۆزدەدا. بەم پێیە گەنجانو خوێندکاران بوون بە میراتگری ئەو ڕۆڵەی پرۆلیتاریا دەیگێڕا. ئەم قسەیەش لەو بۆچوونەی سۆسیۆلۆگی ئەڵەمانی "هربرت مارکۆزە"وە نزیکە کە جەختی لەسەر توانای ڕۆشنبیرانو خوێندکاران دەکردەوە، بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری ڕیشەیی لە کۆمەڵگەدا.

سەرەتاکانی ئەم ئاقارە ڕەخنەییە لە ناوەڕاستی سەدەی پێشوودا دەستی پێکرد، ئەویش بە هەوڵی هەندێ سۆسیۆلۆگەوە دیار بوو کە دەیانویست لە جیهانی دوای دووەم جەنگی جیهانی بکۆڵنەوەو شرۆڤەی بکەن، جیهانێك کە

بەهۆی کەڵەکەبوونی پێشکەوتنی زانستیو تەکنۆلۆژیەوە، هێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرەو هەڵکشانی زیاتر دەچوو. لە پای ئەمەش کۆمەڵگەی ئەمریکی وەرگۆڕا بۆ کۆمەڵگەیەکی بەرخۆری.

ئەو تیۆریە ڕەخنەییە شانی دا دابووە سەر زیادبوونی سانسۆرو نەمانی جیاوازی، لە نێوان چەپو ڕاستو دەرکەوتنی سەرەتاکانی ئاوابوونی سوسیالیزمو زاڵبوونی کۆمەڵگە بەسەر زۆرێك لە کێشە جەوهەریەکانیدا، ئەمەش مانای وا بوو کە شوێنێك بۆ ململانێی ئایدیۆلۆژی نەماوەتەوە، بەڵام هەر هێندەی سەرەتای شەستەکان دەستی پێکرد، ئەو تەوژمی ئومێدو گەشبینیەی بیرکردنەوەی هەندێ تیۆرسینی پەنجاکانی داگیر کردبوو، بەرەو کاڵبوونەوە چوو، لەبەرئەوەی هێزگەلێکی تازە دروست بووو کە دژی هێرشە سێ قۆڵیەکەی سەر وڵاتی میسرو جەنگی ڤێتنامو جەزائیر وەستانەوە، هەروەها وەستانەوەی کرێکارانو رۆشنبیران دژی ستالینیەت، سەرەنجام ئەمانە بوونە هێزێکی ئۆپۆزسیۆنی تازەو بوونە خاڵی دەسپێك بۆ دروستبوونی بزاوتێکی چەپی نوێ لە ئەورووپادا.

لە ئەمریکایش جوڵەو بزاوتی ڕەش پێستەکان کە بە بزاوتی مافە مەدەنیەکان ناسرابوون، بە ڕابەرایەتی "مارتن لۆتەر کینگ"و شۆڕشی کوباو بیروو بۆچوونەکانی "گیڤارا"

سەبارەت بە شۆڕشی نێو دەوڵەتیو سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە باشوری خۆرهەڵاتی ئاسیا، کاریگەری زۆری لەسەر دروستبوونی بزاوتی چەپی نوێ هەبوو، ئەمە سەرەڕای ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتیو ئابووریو کلتووریەی رۆژبەرۆژ هەستی نامۆیی لای گەنجانو خوێندکاران زیاتر دەکردو زەمینەی پەیوەندیکردنو تێکەڵبوونی بە بزاوتە خوێندکاریەکان خۆشتر دەکرد، تا لە رێگەی ئەوەوە بتوانن گوزارشت لەو ڕقو بێزاریە بکەن کە دەرهەق بە چۆنیەتی مومارەسەکردنی سیاسەتی ئەو سەردەمو قۆناغە هەیانبوو.

بیروو بۆچوونی بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرتو شیکاریەکانیان لە بواری کۆمەڵناسی رەخنەییدا، بە تایبەتیش "ئادۆرنۆ"و "مارکۆزە"، رۆڵێکی بەرچاویان لە جۆشدانی خوێندکارانو ورووژاندنی پرسیارگەلێکی رەخنەییو بیرو بۆچوونی کۆمەڵایەتی نوێدا بینی، کە بە ئاشکرا نارەزاییو بێزاریی خوێندکارانی بەرامبەر بەو سستمە کۆمەڵایەتیو ئایدۆلۆژیەی لە ئارەدابوو نیشان دەدا، هەرووەها هۆشیاریان دەرهەق بەو مەترسیە قوڵانەی، لەوانەیە چەکە ئەتۆمیەکانو هەڕەشەی بەردەوامی بەرپابوونی شەڕ دروستی بکەن. ئەم شتانە لەو دروشمو داخوازیانەدا رەنگی دایەوە کە خوێندکاران بەرزیان کردبووەوە، وەکو (با لەبری شەڕ خۆشەویستی بکەین).

کۆی ئەم ڕووداووکێشانە، خوێندکارانو لاوانی بەخۆیەوە خەریك کردبوو، لەمەشدا زۆرێك لە ڕۆشنبیرانو مامۆستایانی زانکۆکان بە تایبەت لە بەشەکانی کۆمەڵناسیو سیاسەتو ئەنسرۆپۆلۆژیا هاوخەمیان بوون. بە تایبەت دوای ئەو گۆڕانکاریانەی لە زۆربەی وڵاتانی خۆرئاوادا بەسەر سەندیکاکانی کرێکاراندا هاتو بوون بە ڕێکخراوگەلێکی بیرۆکراسیو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ، لەداموو دەزگا سەرمایەداریەکاندا بوونە شەریکە بەشی قازانجو هەڵپەکردن.

هەروەها مەسەلەی ئازادیەکانو یەکسانیو سەربەخۆیی زانکۆو داخوازی بۆ چاکسازیکردنو بەشداریکردنی خوێندکاران لە بەڕێوەبردنی زانکۆکانو ڕەخساندنی هەل لەبەردەمیاندا، بۆ ئەوەی دەستیان لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیاندا هەبێت، لە گرنگترین ئەو داواکاریو دروشمانە بوون کە شۆڕشی خوێندکاران بەرزی کردبوونەوە. ئەمەش دەسپێکی هاتنە ئارای هۆشیاریەکی نوێو گرتنە بەری تیۆریایەکی جیهانی بوو کە پێداگری لەسەر خواستی ئارادیو ئازادبوون دەکردەوە، بۆ ئەوەی خوێندکاران ڕۆڵێکی سیاسیو ڕۆشنبیری تازەیان لە زانکۆو کۆمەڵگەدا هەبێتو لە ڕێی گۆڕینی کۆمەڵگەوە، بتوانن جیهان بگۆڕنو چارەنووس لە دەستی خۆیاندا بێت. هیچ یەك لە مانەش نەدەهاتەدی، تەنها لە ڕێی ڕەتکردنەوەی ئەو

ستەمە باوو بوونیادە کۆمەڵایەتیو ئایدیۆلۆژیەوە نەبوایە کە پشتیوانیان لێدەکرا.

هاوکات بیروبۆچوونە شۆڕشگێڕیەکانی "هربرت مارکۆزە"، بوون بە سمبولو دروشمو خوێندکاران بەرزیان دەکردنەوەو لە خۆپیشاندانو ناڕەزایی دەربڕینەکانیاندا بەکاریان دەهێنان، ئەمە نەك هەر لە ئەڵەمانیادا بە تەنها، بەڵکو لە ئەمریکاو فەرەنساو وڵاتانی دیکەی ئەورووپیشدا. چونکە "مارکۆزە" گوزارشتی لە بۆچوون گەلێك کرد کە ئەوانی دیکە نەیانتوانی باسی لێبکەن، ئەویش لە ڕێی ئازادکردنی فینۆمینۆلۆژیای مارکسیزمەوە. لەم کارەشیدا پشتی بە "هیگڵ"و "سارتەر" بەستبوو. وەك چۆن پشتی بە "هۆسێرل"یش بەستبوو، بەتایبەت لە ڕەخنەگرتنیان لە زانستو تەکنۆلۆژیا، چونکە بەرەو پێشچوونی زانستو تەکنۆلۆژیا نیشانی دەدات کە ڕەوتی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای سەرمایەداری دامەزراوە.

هاوکات لە دۆخێکی وادا زانستو تەکنۆلۆژیا شەرعیەت بە پەیوەندیەکانی دەسەڵاتخوازی دەدەن، کارێك کەوا دەکات دروستبوونو هاتنە ئارای هەر ئەڵتەرناتیڤێکی نوێ پەکبخات. تەنها ڕێگایەکیش کە لەبەردەم تێپەڕاندنی ئەم دۆخەدا بێت، ناڕەزایی خۆبەخۆی تاکە پەراوێز نشینەکانە لە دژی ئەو ستەمە سیاسیو کۆمەڵایەتیەی لە ئارەدایە. ئەم دیدو بۆچوونانە "مارکۆزە"یان کردە فەیلەسوفی شۆڕشی

خوێندکارانو سەرکردەی فیکری ئەو بزاوتەو تیژەکانیشی بوونە درووشمی شۆڕشگێڕانە. کاری ڕێکەوت نەبوو ئەو خوێندکاروو لاوانەی لە واقعی کۆمەڵایەتی خۆیان یاخی بوون، درك بەوە بکەن کە دیدو بۆچوونەکانی "مارکۆزە"، بە تایبەت رووی ئەوان دەگرێتەوەو ئەمەش وایان لێدەکات هەست بکەن رێگای ئازادی بەروویاندا کراوەیە.

بەمجۆرە دیدو بۆچوونەکانی "مارکۆزە"، زۆر بەخێرایی لە نێوان گەنجانو خوێندکاراندا بڵاوبووەوەو بوو بە ڕێنیشاندەری شۆڕشو ڕاپەڕینەکەیان، کە یەکەمجار لە هەردوو زانکۆی (بێرکلی)و (کالیفۆرنیا) لە ساڵی 1965 دەستی پێکرد، دوای ئەوەی پۆلیس ڕێی لەو خۆپیشاندانانە گرت کە لە دژی شەڕی ڤێتنام ئەنجام دەدرا. دواتر ساڵی 1968 لە پاریس لە مانگی ئایاردا شۆڕش تەقییەوەو دواتر لە هاوینی هەمان ساڵدا فرانکفۆرتو بەرلینی گرتەوە، تا گەیشت بە ئیتالیاو ئیسپانیاو چیکۆسلۆڤاکیاو وڵاتی ئەورووپی دیکە.

خۆپیشاندان شەقامە گەورەکانی پاریسو فرانکفۆرتو بەرلینی خۆرئاوای گرتەوەو پشێویو تێکدانو کاری توندوتیژی لێکەوتەوە، خوێندکاران لە ڕێی ئەو کارانەوە داوای ئازادیو خۆشەویستیو دیموکراسیان دەکرد. چەند گرووپێکی بچووکیش لە کرێکارانو پەراوێزخراوو زەحمەتکێشو پەناهەندەو ژینگە پارێزەکان و.. هتد، بەشداری ئەو خۆپیشاندانەی

خوێندکارانیان کرد. کاتێك دەسەڵاتداران نەیانتوانی تورەیی و یاخی بوونی ئەوانە کۆنترۆڵ بکەن، بە توندی رووبەڕوویان بوونەوەو وەکی کۆمەڵە چەتەیەکی ئاژاوەگێر کە ئامانجیان تێکدانو ئاژاوە نانەوەیە، مامەڵەیان لەگەڵدا کردن.

"رۆدی دۆتچکە" ڕابەری بزوتنەوەی خوێندکاران لە ئەڵەمانیاو هەروەها "دانیال کوهن بندیت" سەرکردەی شۆڕشی ئایار لە پاریس، بۆچوونیان دەربارەی شۆڕشی نێو دەوڵەتی سەرچاوەکەی "هربرت مارکۆزە"ی مامۆستایان بوو. چونکە "مارکۆزە" تەئکیدی دەکردەوە کە بزاوتی خوێندکاران شۆڕشێکە دژ بە دەسەڵاتو سەرکوتکردن، لەبەرئەوە پێویستە شۆڕشی خوێندکاران شۆڕشێکی ڕادیکاڵانە بێت، بۆ بەگژاچوونەوەی ستەمو چەوساندنەوەو دەسەڵاتی کۆمەڵگەی سەرمایەداری کە وەك یەك ئازادی تاکە کەسو کۆمەڵگە پێشێل دەکات.

هەروەها رەخنەشی ئاڕاستەی سوسیالیزمی تەقلیدی کردو داوای دەست بەرداربوونی چەمکە تەقلیدیەکانی کرد. "مارکۆزە" سۆسیالیزم وەکی خۆی ڕەتناکاتەوە، بەڵکو ئەوەی ڕەتی دەکاتەوە سوسیالیزمی تەقلیدیە لە ئەوروپاو ئەمریکاشدا. ئەوەی ڕەخنەی ئاڕاستە دەکرد هەر بە تەنها زانکۆ نەبوو، بەڵکو کۆی کۆمەڵگەی سەرمایەداری بوو. "مارکۆزە" لەو قۆناغەدا لە نێوان بەرلینو فرانکفۆرتدا لە هاتوچۆدا بوو، لە ناو زانکۆکانی ئەڵەمانیادا لێکچەرو وتارەکانی دەداو هەر

خۆشی ڕابەرایەتی خۆپیشاندانی خوێندکارانی دەکرد، لە دژی دامو دەزگاکانی ئەمریکا لە ئەڵەمانیا، وەك نارەزاییەك لە دژی شەڕی ڤێتنام.

لەلایەکی ترەوە " ڕۆدی دۆتچکە" بەردەوام جەختی لەسەر گۆڕینی چەمکە تەقلیدیە باوەکان دەکردەوە، ئەویش لە ڕێی ڕەخنەگرتنو نارەزایی نیشاندان دژی دەسەڵاتی خۆسەپێنەرانەی کۆمەڵگەی سەرمایەداری، بە تایبەتی ئەو دەسەڵاتە خۆسەپێنەرەی ئازادی تاکەکەسو کۆمەڵ سنووردار دەکات. هاوکات "دۆتچکە" وەها سەیری مەسەلەی ئازادیو رزگاربوونی دەکرد کە مەسەلەیەکی جیهانی سەرتاسەریەو دوپاتی دەکردەوە، ناکرێت ئازادی لە ئەورووپا جیابکرێتەوە لە ئازادی لە وڵاتانی دیکەی جیهاندا.

هەروەها پێیوابوو زانکۆ تەنها بۆتە دەزگایەکی بیرۆکراتیو خۆی خستۆتە خزمەت کۆمەڵگەو ئەو سستەمەی لە ئارەدایە، بەبێ ئەوەی ئاگاداری قەیرانەکانی خۆی بێتو بە قووڵی تێی بگات. ئەگەر گەندەڵی زانکۆی گرتبێتەوە، ئەوا ڕەنگدانەوەی گەندەڵبوونی کۆمەڵگەو دامودەزگاکانیەتی. بزاوتی خوێندکارانو لاوانیش هیچ نییە جگە لە هەوڵێك بۆ گۆڕینی کۆمەڵگە، لەبەرئەوەی پەرچەکردارە بەرامبەر ئەو دیاردەی نیگەرانیو تێناوارە بوونەی گەنجان دووچاری بوونو کۆمەڵگەی بەرخۆری دەیسەپێنێت بەسەریاندا.

هەرچی "دانیال کوهن بندیت"ی سەرکردەی شۆڕشی خوێندکارانی شاری پاریسیشە، ئەوا دوای تەنگ پێهەڵچنینی لەلایەن پۆلیسەوە، پاریسی بەجێ هێشتو روویکردە شاری فرانکفۆرت لە ئەڵەمانیا. ئەم پێیوابوو شۆڕش لە زانکۆکانەوە دەست پێدەکاتو بە شۆڕشکردن بەسەر سستمی کۆمەڵایەتیدا کۆتایی دێت. بەبۆچوونی "دانیال کۆهن بندت" زانکۆ دوو رۆڵی دژبەیەك دەگێڕێت، یەکەمیان ئەوەیە کە مەعریفەو زانینمان دەداتیو مەڵبەندێکە تیایدا تیۆریا زانستیەکان بەشێوەیەکی سەربەخۆ گەشەی تیا دەکەنو برەو دەسێنن، بەڵام رۆڵی دووەمیان ئەوەیە دەبێتە دەزگایەکی بیرۆکراتیو دەستی کارو فەرمانبەر ئامادەدەکات، بۆ ئەو سستمە کۆمەڵایەتیەی پێویستی پێیانە. لە ئێستادا سستمی سەرمایەداریو بازاڕی ئازادو وایکردووە، رۆڵی ئابووری زانکۆ گرنگی زیاتری پێبدرێت، ئەمەش لەسەر حسابی زانستو زانینە.

دوا جار دەبێت بڵێین، لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە بزاوتی خوێندکارانو لاوان، تەواوی وڵاتانی ئەورووپای گرتەوە، بە تایبەت فەرەنساو ئەڵەمانیاو ئیتاڵیاو تەنانەت وڵاتانی سوسیالستیو هەندێ لە وڵاتانی جیهانی سێهەمیش، لەو پرۆسەیە بێبەش نەبوون. بەهۆی ئەو هەستی ترسو نیگەرانیە لە ئایندە، خوێندکارانو لاوان ئەو کەرەسە شلو ئەرمەی جاران نەمابوون کە بە هەموو ئەو شتانەی دەخرایە بەردەستیانو پێیان

دەوترا ڕازی ببن و پەسەندیان بکەن، بەبێ ئەوەی هۆکارەکانیان بزانن.

ئەمڕۆ و بەبۆنەی تێپەڕبوونی چل ساڵ بەسەر مردنی "دۆتشکە"دا، لە ئەڵمانیا شەقامێکیان بەناوی ئەوەوە ناونا. ئەو شەقامە لە شاری بەرلینەو چل ساڵ لەمەوبەر یەکێک لە پیاوانی ئاسایش لە کاتی خۆپیشاندانەکاندا، لەسەر ئەو شەقامە سێ فیشەکی نا بەسەریەوە، بەڵام وا ئەمڕۆ شەقامەکە بە ناوی "ڕۆدی دۆتچکە"وە ناودەنرێت.

ئێستا چل ساڵ بەسەر شۆڕشی خوێندکارانی فەرەنسا (ئایاری 1968)ی فەرەنسادا تێدەپەڕێت. شۆڕشێك دژ بە دنیای سیاسەتو خێزانو بەرنامە کاڵوکرچەکانی خوێندن. ئەم شۆڕشە نەك هەر فەرەنسا، بەڵکو وڵاتانی دیکەی جیهانیشی گرتەوە. خوێندکاران درووشم گەلێکیان بەرز کردبووەوە کە داوای گۆڕینی بەرنامەکانیان دەکرد (بەرنامەی خوێندنو ژیان)، لەگەڵ دابینکردنی داهاتوو بۆیان. لەم سەرووبەندەدا کرێکارانیش داوایاندەکرد مووچەکانیان بۆ زیاد بکرێت، خوێندکاران خۆیان تێکەڵ بەوانکردو درووشمی (مووچەیەکی کەمو بچووك، لە بەرامبەر تانکی قورسو گراندا) بەرزکردەوە.

هەندێ لە کرێکاران دەستیان بەسەر چەند کارگەیەکدا گرت، تا خۆیان سەرپەرشتی بکەنو بەڕێوەی بەرن. هەندێ لە خوێندکارانیش چەند زانکۆیەکیان کۆنترۆڵکرد. جمووجۆڵەکانی خۆ پیشاندەران، هەر ڕستێك خواستو داواکاری نەبوو. سیاسەت تێکەڵ بە ئایدیۆلۆژیا بوو. ئەوەی دنەی خۆ پیشاندانەکانی پاریسی دەداو مانگرتنەکانی ئەوێی گەرمتر دەکرد، ئەو خۆپیشاندانە گەورەو بەرفراوانانەی

ئەمریکا بوو دژی جەنگی ڤێتنام. خۆپیشاندەران بەهێزەکانی ئاسایشدا هەڵپژانو هەندێ خوێن ڕژا. سەدان هەزار کەس ڕژانە سەر شەقامەکان. حکومەت ناچار بوو وادەی هەڵبژاردن دیاری بکاتو دیگۆلیەکان تیایدا سەرکەوتن، بەڵام "دیگۆل" دەستی لەکار کێشایەوە. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش، دەسەڵات ناچار بوو واز لە لووت بەرزی بهێنێ. لە ژێر فشاری شەقامدا سەرۆك "لیندۆن جۆنسۆن" ڕایگەیاند، ڕازییە بە ئەنجامدانی دانووستاندن لەگەڵ سەرکردەکانی ڤێتنامی باکووردا.

لە ئایاری 1968 دا فەلسەفە دابەزیە ناو شەقامەکانی پاریس. لەوێدا "جان پۆل سارتەرو ڕۆلان پارتو میشال فۆکۆو لوی ئالتۆسێرو لیڤی شتراوس"، تێکەڵ بە خوێندکارانو کرێکاران بوون. هەموان لە دژی دامو دەزگا موحافیزکارەکان وەستانەوە، بە دامو دەزگاکانی پارتی کۆمۆنستی فەرەنسیشەوە، چونکە ئەو پارتە هەڵوێستی دژ بە جموجۆڵی خوێندکارانی وەرگرتو هاوکات پشتیوانی خۆی، لە هێرشو پەلامارەکانی یەکیەتی سۆڤیەت بۆ سەر چیکۆسلۆڤاکیا ڕاگەیاند. حیزبی کۆمۆنیست بە حیزبێکی کۆنەپەرست ئەژمار کرا کە تەنها خواستی گەیشتنبوو بە دەسەڵات، لە ڕێی گەمە تەقلیدیو سواوەکەی دیموکراسیەوە.

لای خۆیەوە فەلسەفەش شۆڕشێکی بەخۆیەوە بینی کە بووە مایەی سەرهەڵدانی ژمارەیەك فەیلەسوفی نوێ، دیارترینیان بریتی بوون لە: "جاك دێریداو بێرنارد هنری لیڤی". بەشێکی زۆری گەورە فەیلەسوفانیش روویان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد، کارێك کە بووە مایەی ئەوەی کاریگەریەکی زۆر لەسەر زانکۆکانی ئەوێ جێبهێڵێت. هەندێکی لە کاروو بەرهەمەکانی "ئیدوارد سەعید"دا هەست پێدەکەین، بە تایبەت لە بواری ڕەخنەی ئەدەبیدا.

هاوکات لە وڵاتانی ئێمەشدا ساڵی 1968، خوێندکاران کەوتنە خۆیانو ڕاپەڕین، بەتایبەت لە بەیرووتو قاهیرە. خوێندکاران کاتێك کەوتنە ئەو جموجۆڵە، هێشتا ساڵێك بەسەر شکستی حوزەیرانی 1967 تێنەپەڕی بوو. ڕاپەڕینی خوێندکاران لای ئێمە هۆکارەکەی خواستی خوێندکاریانە نەبوو، هیچ یەك لەوانە داوای یان پێشنیاری بەرنامەیەکی ئەکادیمی جیاوازتریان نەدەکردو کارەکەیان دژی ترادسیۆنی زانکۆیی نەبوو، چونکە ئێمە تا هەنووکەش خاوەنی ئەو جۆرە لە ترادسیۆنی زانکۆیی نین. هۆکاری ئەو ڕاپەڕینانە سیاسی بوو. ناڕەزایەتی بوو دژی شکست. سەرکوتکردن لای ئێمە زۆر لەوەی فەرەنسا سەختتربوو. خوێندکارانی ئێمە بوون بە خێڵ: خێڵی

ڕاستڕەوەکان لە دژی خێڵی چەپڕەوەکان. پێکدادانو ئامبازبوونی یەکتری لە نێوان ئەو دوو خێڵەدا، بوو بەشتێکی ڕۆتینیو ئاسایی. گۆرانیەکانی "شێخ ئیمام"و شیعرەکانی "ئەحمەد فوئاد نەجم" لە میسر، ترۆپکی بیرکردنەوەی فەلسەفی ڕادیکالانەبوو. هەندێك لەوانەی درووشمی خوێندکارانی فەرەنسایان هەڵگرتبوو، بە چاوێکی سەیر تەماشا دەکرانو نەشاز بوون. بە کورتیەکەی لای ئێمە دەرەنجامی ئەو خۆپیشاندانانە، بە شکستی زانکۆکانو خوێندکارانو پاشە کشەکردنیان کۆتایی هات.

هیچ کەس لەو سەردەمەدا دیقەتی ئەوەی نەدا کە شۆڕشێکی پێچەوانە بەڕێوەیە، ئەویش بە بڕیارو بە پاڵپشتیکردنی فەرمی دەوڵەت. کاریگەریەکانی ئەم شۆڕشە پێچەوانەیەش لە هەشتاکانو نەوەدەکانی سەدەی ڕابردودا بەدەرکەوتو هەتا ئێستاش کاری خۆی دەکات. شۆڕشێك کە هەموو چەمکە غەیبانیو سرووتنامێزو مەزهەبیەکانی گەڕاندەوە ناو زانکۆکان.

لە فەرەنسا ڕاپەڕینو شۆڕشی خوێندکاران، فەلسەفەی نوێی بەرهەم هێنا، بەڵام لە وڵاتانی ئێمە فەلسەفە هەڵهات.. فەیلەسوفەکان ئاوابوونو هۆڵەکانی خوێندنیش بۆ "بن لادن"و "زەواهیری"و "زەرقاوی"و هێزە ئایینیو

مەزهەبیەکان چۆڵ بوون، بەڵام بابزانین دوای چل ساڵ لە شۆڕشی خوێندکارانی 1968 ئەمڕۆ چ باسە؟

دوای چل ساڵ، گەنجانی دوێنێ بوونەتە کەسانی پیروو پەککەوتە. هەندێکیان لەناوەندی دەسەڵاتدانو بەرپرسیارێتی سیاسیان لە ئەستۆیە (وەك دانیال کوهین بندت. و: کوردی)، یان بەرپرسی ئەو زانکۆیانەن کە لە دژی ڕاپەڕینو بەگژ سستمی خوێندنەکەیدا چوونەوە. هەندێکی دیکەیان (کە نموونەی ئەمانە لە وڵاتانی ئێمەدا زۆرە)، لەوپەڕی چەپەوە گواستیانەوە بۆ ئەوپەڕی ڕاست. لە تیۆریزەکردنی تێزەو تیورەکانی "ماوتسی تۆنگ‌و چی گیڤارا"و شۆڕشی بەردەوام وازیان هێنا، بۆ لایەنگیری "جۆرج ۆکەر بۆش". پێش چل ساڵ لەمەوبەر فەلسەفە لە زانکۆکانی پاریسەوە دابەزیە سەر شەقامەکانی فەرەنسا، بۆ ئەوەی ئایدیاو بیروو بۆچوونی تازە بخوڵقێنێ. لای ئێمەش کاتێك ئایدیالە نموونەییەکان دابەزینە ناو زانکۆکان، زانکۆکانیان کرد بە شەقامگەلێکی دواکەوتوو.

## بەرایی:

"ماركۆزە"یەكێكە لە بیرمەندە دیاروو مەزنەكانی سەدەی بیستەم.. ئەم پیاوە كۆی پڕۆژە فیكریو فەلسەفیەكەی خۆی تەرخانكرد، بۆ ڕەخنەكردنی سستمی سەرمایەداریو كۆمەڵگەی بەرخۆریو دەسەڵاتی ئەقڵانیەتی تەكنۆلۆژی.. خویندنەوەی ئەو بۆ واقعی تازەی سستمی سەرمایەداری، وای لێكرد بە جۆرێكی دی بیر لە شۆڕشو گۆڕانو رووبەڕوو بوونەوەی دەسەڵات بكاتەوە، جیاواز لەو تێزو تیۆرە باوانەی بەرهەمی فیكری بیرمەندانی سەدەی نۆزدەهەم بوون، بەتایبەتیش تێزو تیۆرەكانی بیرمەندێكی گەورەی وەك "كارل ماركس".

"ماركۆزە"جیاواز لە تێڕووانینەكانی "ماركس" پێی وانەبووهێزی گۆڕانخوازو شۆڕشگێڕ لەناو سستمی سەرمایەداریدا چینی پڕۆلیتاریا بێت، لەبەرئەوەی پاش ئەو گۆڕانكاریە خێرایانەی بەسەر كۆی ئەو سستمەدا هات، چینی پڕۆلیتاریا لە هێزێكی شۆڕشگێڕەوە گۆڕدراوە بە

هێزێکی پاسیف‌و کۆنسێرڤاتیف‌و بووەتە هەوێنی ئارامی، ڕاگرتنی بەلانسی سیستمی سەرمایەداری. بۆیە هەنووکە بۆ دەرچوون لەم واقعە، پێویستە ستراتیژیەتێکی نوێ بۆ شۆڕش‌و گۆڕانی هەلومەرجەکە دابڕێژین‌و لەودیو چینی پرۆلیتاریاوە،بیر لە هێزو توێژی دیکە بکەینەوە کە بتوانن ببنە داینامۆی شۆڕش‌و هەوێنی گۆڕان. لەو هێزە ڕادیکال‌و کاریگەرانەش کە "مارکۆزە"چاوی لە سەریان بوو بۆ هەستان بە کارێکی وەها، گەنجان‌و خوێندکاران‌و بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکانی جیهانی سێهەم‌و تەواوی ئەو گروپانە بوون کە لە پەراوێزی کۆمەڵگەدا دەژیان‌و لە هەموو ڕیزبەندی‌و دیسپلینێکی کۆمەڵایەتیش بە دووربوون.

**مارکۆزەو گەنجان:**

پاش ئەوەی "مارکۆزە"دڵنیا بوو لەوەی ناکرێت ئومێدی گۆڕان‌و شۆڕشکردن بە هێزێکی کلاسیکی وەک پرۆلیتاریاوە گرێ بدات، بۆ گۆڕین‌و ژێرەو ژوورکردنی واقعی کۆمەڵگەی سەرمایەداری، کەوتە سۆراخکردنی هێزگەلێکی دیکە کە توانای ئەنجامدانی ئەو کارەیان هەبێت‌و بتوانن ببنە ئامرازێکی عەمەلی‌و ئەو پرۆسەی گۆڕانە ئەنجام بدەن کە داوای دەکرد. "مارکۆزە

بەرنامەیەکی روونو دیاریکراوی نەبوو تا ئەو هێزانە بتوانن پشتی پێ ببەستن، بۆ گۆڕینی واقعی حاڵی کۆمەڵگەی سەرمایەداری لە وڵاتانی خۆرئاوادا.

لە شەستەکانداو کاتێك خوێنکارانو لاوان وەك هێزێکی شۆڕشگێڕی نوێ هاتنە ئارا، "مارکۆزە" گرنگی زیاتری پێدانو لە پرۆژە فەلسەفیو رەخنەییەکەیدا شوێنگەیەکی تایبەتی پێبەخشین. ئاوڕادانەوەی ئەم بیرایارە لە گەنجانو قسەکردن لەسەریان نێوبانگێکی زۆری بۆ پەیدا کردو گەنجانیش بە گەرمیەوە پێشوازیان لێکرد، لەبەرئەوەی دەستی هەبوو لەوەدا کە رۆڵێکی دیارو بەرچاوی بەخشی پێیان لە ئاڕاستەکردنی رووداوەکانی جیهاندا. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە بیریارانی دی ئەم هێزەیان فەرامۆشکردبوو یاخود رۆڵێکی لاوەکیان پێدابوون.

"مارکۆزە" پێی وابوو شۆڕشی گەنجان زۆر بەتوندی تەئکید لەو بیروبۆچوونانەی دەکەنەوە کە پێشتر لە نووسینەکانیدا باسی لێکردبوو. لەو نووسینانەیدا "مارکۆزە" ڕایگەیاندبوو کە (هێزە شۆڕشگێڕە تەقلیدیەکانی وەك پرۆلیتاریا بەهۆی ئاوێتە بوونی بە کۆمەڵگەی سەرمایەداریو دیسپلینکردنی لەلایەن ئەو سستەمەوە، تەواوی توانا شۆڕشگێڕیەکانی خۆی لە دەست داوەو تەنانەت بۆتە هێزێکی وا کە لە خەمی پاراستنی بارودۆخەکەدایەو دژی هەموو گۆڕانێکە).

"مارکۆزە" لە دوابەشی کتێبی (مرۆڤی تاك ڕەهەند)دا، باس لەوە دەکات:(ڕزگاربوونی کۆمەڵگە لەسەر دەستی هیچ یەك لەو گروپانەوە نابێت کە لەلایەن سستمی سەرمایەداریەوە دیسپلین کراون، بەڵکو کارێکی وا لەڕێی گروپە پەراوێزخراوەکانو چەوساوەو ئەو هێزانەوە ئەنجام دەدرێت کە لە دەرەوەی بازنەی پرۆسەی بەرهەمهێناندان).

زۆرێك لە نووسەران ئەم بۆچوونانەی "مارکۆزە" یان والێکدایەوە کە تەعبیرە لە دەستەوستانیو نائومێدیەکی قووڵ، دەرهەق بە ئەنجامدانی گۆڕانکاریەکی ڕاستەقینە لە هەناوی کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا، بەڵام گەنجان پێشوازییان لێکردو وایان لێکدایەوە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوان بوونەتە میراتگری ڕاستەقینەی رۆحی شۆڕش لە سەرتاسەری جیهاندا.

ئاساییە کە بۆچوونێکی وا لەناو گەنجانی دنیاداو بەتایبەتیش لەناو وڵاتە پیشەسازیە پێشکەوتووەکانی وەك وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکاو ئەوروپادا ڕەواج پەیدا بکات، چونکە گەنج لەو وڵاتانەدا لە رووی دەروونیەوە ئامادەی ئەوەی تیدایە ئەو بۆچوونە قبووڵ بکات کە (ئەو کائنێکی نەخواستراوو تەریك کراوەو گەورەکانیش گوێی بۆ ڕاناگرنو هیچ ڕۆڵێکیشی نادەنێ لە دیارکردنی ڕەوتی رووداوەکاندا).

ڕەنگە یەکێك لە کێشە سەرەکیەکانی هەرزەکاران لەو وڵاتانەدا ئەوە بوو بێت کە گەورەکان گوێیان لێناگرنو خەمساردن بەرامبەریان، لەبەرئەوەی گەورەکان تەواوی تواناکانی خۆیان لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا بە خەرج دەدەنو ئەمەش دەرفەتی ئەوەیان بۆ ناهێڵێتەوە،تا لەگەڵ ئەوەکانیاندا کۆببنەوەو چارەسەری کێشەکانیان بۆ بکەن. لێرەوە کاتێك بیریارێکی وەکی "مارکۆزە" دێتو دەڵێت: (ئەوانە ڕزگارکەری نوێی مرۆڤایەتین)، ئاساییە گەر گەنجان وابەستەی بنو وەکی قسەکەری خۆیان لێی بڕوانن.

لەلایەکی تریشەوە هەر ئاساییە گەر گەنجان بە پیر فەیلەسوفێکەوە بچن کە باس لە کۆتایی هاتنی بانگەشە بۆ سەرکەوتنی (ئیرۆس بەسەر لۆگۆس)دا بکات. "مارکۆزە" یەکێك بوو لەو بیرمەندانەی داوای ئەوەی دەکرد، هێزی خەیاڵو فانتازیا لە مرۆڤدا زیندو بکرێتەوە لەبەرامبەر توانا لۆژیکیەکانیدا، چێژوەرگرتنیش لە خۆشەویستیو ستاتیکا بکرێتە ئامانجی سەرەکی ژیانی مرۆڤ لە کۆمەڵگەی نوێدا. بێگومان ئەمە خەونو خواستی گەنجانە لە هەموو سەردەمێکدا. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا کە ڕۆحی بازرگانی تیایدا باڵادەستەو لەو کۆمەڵگایانەدا کە لە هەموو شتێکدا شوێن قازانج دەکەون، گەنجان زیاتر بە تاسەی ئەو خەونو خواستانەوەن.

"مارکۆزە" داوای دەکرد کۆمەڵگەی نوێ لەسەر بنەمای گەمەو عەشقو ئەڤین دابمەزرێت، واتە تەواو پێچەوانەی ئەو کۆمەڵگە بەرخۆریە بێت کە مرۆڤی دیل کردووەو ژیانی لە عادەتێکی خۆشو پاراوەوە گۆڕیوە بە تەوقێك. ئەوەی وایکرد گەنجان بە پەرۆشەوە باوەش بۆ ڕاو بۆچـــوونەکانی "مـــارکۆزە" بکەنەوە، ئەوە بوو کە ئەو جـــەختی لەسەر بایەخو گـــرنگی سێکسو ئـــەڤینداری دەکردەوەو بە تاکە ئەرکێکی سەرەکی دەزانی کە دەبێت مرۆڤ لە کۆمەڵگەی نوێدا خۆی بۆ تەرخان بکات.

**لە خوێندکارانو گەنجانەوە بۆ جیهانی سێهەم:**

سەرەڕای گرنگی ئەو ڕۆڵەی "مارکۆزە" دابووی بە گەنجانو بەتایبەتیش بە توێژی خوێندکاران لە ئاڕاستەکردنی ڕەوتی ڕووداوەکان لە ڕۆژگاری تازەدا، بەڵام لەو باوەڕەدا نەبوونەوان تەنها هێزێك بن بتوانن کۆمەڵگەی کۆن بە کۆمەڵگەیەکی نوێ بگۆڕن. ئەگەر خوێندکارانو لاوان ئەو توێژە بن کە لەناو کۆمەڵگەی پیشەسازیدا لە پەراوێزدا بژین، ئەوا لە دەرەوەشدا توێژێکی دیکە هەیە کە شۆڕشگێڕەکانی جیهانی سێهەمنو ئەمانیش دەکەونە پەراوێزو کەناری کۆمەڵگە پیشەسازیەکانەوە. شۆڕشگێڕانی

جیهانی سێهەم وەکی گروپ گەلێکی جیهانی خۆرئاوا، چەوساوەو تەریك کراونو ژیانی کۆمەڵگە پیشەسازیە پێشکەوتووەکان نەیشێواندونو دەرگیری بەها بازرگانیە هەلپەرستانەکەی نەبوون.

خوێندکاران سەرەڕای هەموو ئەو ڕاپەڕینو یاخیبوونانەی ئەنجامی دەدەن، ناتوانین وەکی هێزێکی شۆڕشگێڕ ناونووسیان بکەین. وەك چۆن ئەو گەنجانەشی لە دژی ترادسیۆن ڕادەپەڕن (وەکی هیپیەکان)، ئەلتەرناتیڤو میراتگری چینی پرۆلیتاریا نین لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا. بەڵکو ئەوانە تەنها بە نواندنی ئەو ڕەفتارانەیان دەیانەوێت نافەرۆزی ئەو کۆمەڵگەیەی ئێستاو ئەو بەرخۆریە بکەن کە ئەو سستمە پێشکەشی دەکات. هەروەها دەیانەوێت بەها بازرگانیەکان ڕەتکەنەوەو بەهای خۆشەویستیو ستاتیکی لە جێگەیان دابنێن. لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین ڕەفتاری ئەم گروپانە تەعبیرە لە نافەرۆزەکردنی ئەم کۆمەڵگەیە. بەڵام ئەمانە بەهێزی شۆڕشگێڕ دانانرێن، بەڵکو شۆڕشگێران ئەو گروپە چەوساوەو بێچارانەن کە کەمایەتین لەناوجەرگەی سستمی سەرمایەداریداو بەر لەوانیش بەرەی شۆڕشگێڕی ڕزگاریخوازەکانن لە سەرجەم وڵاتانی جیهانی سێهەمدا.

مرۆڤ دەتوانێت بە ئاسانی لەوە بگاتبۆچی "مارکۆزە" بایەخ بە جیهانی سێهەم دەدات، چونکە واقیع ئەوەی سەلماند کە شۆڕشی ڕزگاریخوازی وڵاتانی دواکەوتوو بوو، پایەکانی سستمی سەرمایەداری هەژاند. ئەو گۆڕانەی شۆڕشی جەزائیری لە فەرەنساو شۆڕشی ڤێتنام لە وڵاتە یەکگرتووەکانی (قەڵای مەزنی سەرمایەدری)دا دروستی کرد، گۆڕانکاریەکی هێندە گەورە بوو تەنانەت لەو کایەو بوارانەشدا کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە بواری سەربازییەوە نییە. لەم سەرووبەندەدا "مارکۆزە" نەیدەتوانی چاوپۆشی لەم حەقیقەتە ئاشکرایە بکاتو خۆی دەرگیری بزاوتی خوێندکاران بکات کە لە چاکترین حاڵەتدا، بزاوتێکە کاریگەری لاوەکیو سنووrداری هەیە.

بەهەرحاڵ لەنێوان گرنگیدان بە گەنجانو بایەخدان بە شۆڕشی ڕزگاریخوازی لە جیهانی سێهەمدا ناکۆکیەکی ئەوتۆ نییە، چونکە خودی گەنجان لە وڵاتە پیشەسازیە پێشکەوتووەکاندا، داکۆکیان لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلانی کۆلۆنیالیکراو دەکردو لەپێناو ئەو مەسەلەیەشدا دەچوونەوە بەگژ سستمی حوکمڕانی لە وڵاتەکانی خۆیاندا. کەواتە "مارکۆزە" لە خواستو ئارەزووی گەنجان دوورنەکەوتەوە، کاتێك ئومێدی مرۆڤایەتی بۆ ڕزگاربوون بە شۆڕسی کۆمەڵگە دواکەوتووەکانەوە گرێدا. بەمجۆرە

"مارکۆزە" بزوتنەوەی خوێندکارانی بە شۆڕشی جیهانی سێهەمەوە گرێداو لەم بارەیەوە دەڵێت: (پێویستە بزوتنەوەی خوێندکاران بتوانن جیهانی سێهەمو مومارەسە شۆڕشگێڕیەکەی ئەو جیهانە، بکەنە بنکەی جەماوەری تایبەت بە خۆیان).

سەبارەت بە هیواوو ئومێدیشی بە وڵاتانی دواکەوتووی جیهانی سێهەم دەڵێت: (وڵاتانی دواکەوتوو، ئەو هەناسە زیندووەی مرۆڤایەتین کە دەتوانن ئەو سستەمە باوەی ئێستا ئافەرۆز بکەن). لێرەوە "مارکۆزە" ئومێدەوار بوو هەماهەنگیەکو جۆرە هاریکاریکردنێکی یەکتری، لەنێوان بزوتنەوە خوێندکاریەکانو هێزە ئۆپۆزسیۆنەکانی ناو وڵاتانی سەرمایەداری لەلایەکو جەماوری شۆڕشگێڕی جیهانی سێیهەم لە لایەکی تر دروست ببێت.

"مارکۆزە" تا سەردەمانێکی زۆر تەنها بیری لە کێشەو گرفتەکانی کۆمەڵگە پیشەسازیە پێشکەوتووەکان دەکردەوە، بەڵام کاتێك درکی بەوە کرد کە ڕێگای چاکسازی کردن لە بەردەم ئەو کۆمەڵگەیانەدا کلۆمدراوە (گەر هاتوو بە تەنها پشتی بەهێزی تایبەتی خۆی بەست)، کەوتە ئاوڕانەوە لە جیهانی سێهەم. بەتایبەت دوای ئەوەی جیهانی سێهەم لەڕێی وڵاتێکی وەکی ڤێتنامەوە،توانی خۆی لەبەردەم جیهانی پیشەسازی پێشکەوتوودا ڕابگرێتو پایەکانی ئەو

سستەمە لەناوخۆیدا بهەژێنێت. "مارکۆزە" لە مەسەلەی شۆڕشدا دەیخواست شۆڕشێك بەرپا بێت کە سەرتاسەری دنیا بگرێتەوەو شۆڕشێکی ئینسانی بێت، نەك شۆڕشێکی لۆکاڵی یاخود چینایەتی.

بێچەندوچوون دەتوانین بڵێنین "دانیال کوهین بندت"، دیارترین کارەکتەری شۆڕشی خوێندکارانی 1968 فەڕەنسایە. ئەو شۆڕشەی کاتی خۆی لە زانکۆی (نانت)ەوە تاوی سەندو گەر لە دواساتەکانیدا ژەنەراڵ "دیگۆل" فریانەکەوتایەو سەرلەنوێ کۆنترۆڵی بارودۆخەکەی نەکردایە، ڕەنگ بوو بۆشاییەکی سیاسی ڕاستەقینەی لە وڵاتدا دروست بکردایەو کۆماری پێنجەمی ڕامباڵیایە. ئەو شۆڕشەی سەرەتا وەك شۆڕشێکی خوێندکاران دەستی پێکرد، دوای ئەوەی سەندیکا کرێکارییەکان دایانە پاڵی و لە زیاد لەشارێکیشدا دەستیان بەسەر کارگەکاندا گرتو جاڕی خۆبەڕێوەبردنیاندا، ئاڕاستەیەکی ترسناکی گرتەبەر.

شۆڕشی 1968 شۆڕشی چەپە ڕادیکالو پەڕگیرەکان بوو، شۆڕشێك بوو لە دژی بۆرژوازیەتو دەسەڵاتی سیاسی ڕاستڕەوەکان، بەڵام هاوکات شۆڕشکیش بوو لە دژی چەپی دۆگماو نوێنەرە فەرمیەکەی کە پارتی کۆمۆنستی فەڕەنسا بوو. لێرەوە هەڵوێستێکی دژبەیەك لەسەر کارەکتەری "دانیال کوهین بندت" دێتەگۆڕێ. لەلایەك هەڵوێستی "ژان پۆڵا سارتەر"ی ڕابەری ڕۆشنبیرانی چەپی فەڕەنسا کە پیرۆزبایی

لە خوێندکاران کرد بەوەی خوێنیان بەبەر شۆڕشدا کردەوە، ئەو خوێنەی کۆمۆنیستە دۆگماکان مەیاندبوویان، لەگەڵ هەڵوێستی "جۆرج مارشێی" سەرۆکی پارتی کۆمۆنستی فەرەنسا کە لەوکاتەدا نەفرەتی لەو ئانارشیستە ئەڵەمانیە کردو لایەنگری دەرکردنی بوو لە فەرەنسا، لەلایەکی ترەوە.

شایەنی باسە "دانیال کوهین بندت" لە ئەڵەمانیا هاتبووە دنیاوەو کوڕی بنەماڵەیەکی جولەکە بوو، لەو کاتەوەی نازییەکان لە ساڵی 1933دا جڵەوی حوکمڕانیان گرتەدەست، پەنادێننە بەر فەرەنساو وەك پەناهەندەیەك لەو وڵاتەدا دەژین. "کوهین" لە فەرەنسادا گەورەبوو. ئەندام بوو لە گروپێکی ئانارشیزمی بچووکدا بەناوی (ڕەشو سوور). خەونی سەرەکی ئەم گروپە ئەوەبوو، خوێنی تازەبکەنەوە بەر چەمکی شۆڕش، ئەو شۆڕشەی بیرووکراسیەتی ستالینیەتو بابەویەت ناپاکییان دەرهەق کردبوو. ئەو بیرۆکراسیەتەش لەو کاتەدا پارتە کۆمۆنیستە تەقلیدیەکان، بەسەرچینی کرێکارانو هێزە چەپەکاندا بەگشتی پراکتیزەیان دەکرد.

شۆڕشی پەتی، شۆڕش لە پێناو شۆڕشدا، شۆڕش لە ناو شۆڕشو بەسەر شۆڕشدا، ئەمە خواستو ویستی ئەو ڕیسکە خوێندکاریە بوو کە لە هۆڵەکانی خوێندنی زانکۆی (نانت)ەوە، دەستی پێکردو پاشان تەواوی فەرەنساو ئەڵەمانیاو چەند وڵاتێکی دیکەی ئەورووپای گرتەوە. سەرەتا کە دەستی پێکرد

پێدەچوو (ئاگرێکی شۆڕشگێڕانە) بێت، جگە لە گڕدانی خۆی بەدەستی خۆی، بەمەبەستی بەتاڵکردنەوەی ئەو وزە شۆڕشگێڕیە چەپێنراوە لای ئەو توێژەی بەسرووشتی خۆی ئامادەیە ببێتە سوتەمەنی هەموو ڕسکێکی ڕادیکالانە کە لاوانە، هیچ ئامانجو بەرنامەیەکی دیکەیان نەبوویێت.

"دانیال کوهین بندت" کە لەسەرووەختی بزوتنەوەکەی ئایاری 1968دا لاوبوو، ئێستا تەمەنی پەنجاوچوار ساڵە. ئەو شۆڕشگێڕەی لە ئاخیدابوو، جێی خۆی بۆ لایەنگرێکی ژیری بزووتنەوەی ژینگەپارێزانی ئەوروپایەکی سەوز چۆڵکرد. لە بری (شەهوەتی شۆڕش) کە بە وتەزای خەونو ئیرادە سەودا لەگەڵا ژیاندا دەکات، (شەهوەتی سیاسەت)ی هێنایە گۆڕێ کە خۆی دەرگیری دیالەکتیکی واقیعو شتە شیاوەکان دەکات. "دانیال کوهین بندت" کە بۆ ماوەی هەشت ساڵ جێگری سەرۆکی شارەوانی شاری فرانکفۆرت بوو، وەك کاندیدای سەوزەکانی ئەڵەمانیا، ئێستاو لە ساڵی 1994 ئەندامە لە پەرلەمانی ئەوروپادا. ئایا ئێستا چۆن ئاوڕ لە ڕابردووی خۆی دەداتەوەو چۆن چۆنی دادگایی سی ساڵی پێش ئێستای خۆی دەکات کە شۆڕشی پەتی دەپەرست؟

با ڕێ بەخۆی بدەین قسە بکات: (شۆڕش وەهمێکە دنەی خەیاڵدانی ئەو کۆمەڵگەیانە دەدات کە لەواقیعدا جگە لە گۆڕان پێویستی بەشتێکیتر نییە. ئایاری 68 شۆڕش نەبوو،

ئێمەش پاڵەوانی بین. هیچ پرۆژەیەکی کۆنکرێتیو دیاریکراومان پێینەبوو، ئەوە نەبێت لە پڕێکدا کەوتینە ناو گێژاوی ڕووداوەکانو ئێمەش سوار ئەو شەپۆلە بووینو مەستی سەرکەوتن بووین. ئەوەی ڕاستی بێت ئێمە شۆڕشگێڕ نەبووین، هێندەی کەڵکەڵەی شۆڕش چووبووە مێشکمانەوە. پێمان وابوو دەرمانی دەردی پیربوونی کۆمۆنیزم، چەپگەرایەتییەکی ڕادیکاڵانەیە. هەر ئەمەش بوو بە ناونیشانی ئەو کتێبەی لە کۆتایی 68دا لەگەڵ براکەمدا چاپمکرد. بەهەرحاڵ، ڕاستە ئێمە وەهمی شۆڕش فریوی دابووین، بەڵام دەستمان هەبوو لە سەندنەوەی شەرعیەت لە کۆمۆنیزمی دۆگماتیست. ئێمە نە ترۆتسکی بووین نەماویی، بەڵکو مارکسیستێکی ئازادبووینو سەرلەنوێ ڕەهەندی ئازادیمان لە فەلسەفەی مارکسیزمدا دۆزییەوە. لەبەر ئەمەش هاوسۆز بووین لەگەڵ بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری کۆمۆنیستەکانی پۆڵۆنیاو چیکۆسلۆڤاکیا، هاوکات لایەنگری ئەو بزاوتەش بووین لە یەکێتی سۆڤیەت کە بەبزاوتی جیابووەکان ناسرابوون.

ئەگەر ڕەخنەی ئێمە لە پارتی کۆمۆنیست ئەوەبوو بێت کە دەستبەرداری شۆڕش بوون، ئەوا لە سەرەتای حەفتاکانیشەوە سەرەی ئێمە هات تا بە شۆڕش بڵێین: ماڵئاوا، بەڵام بۆچی؟ ئەم گۆڕانکاریە چۆن ڕوویدا؟ ڕەنگە بەلای منەوە ئەوە بێت کە تێگەیشتم سیاسەت هەموو شتێك نییە لە ژیاندا، مرۆڤ

ناتوانێت بیستوچوار سەعات بەسیاسەتو بۆ سیاسەت بژی. بەهەرحاڵ مرۆڤی شۆڕشگێڕ کەسێکە هەموو ژیانی خۆی بۆ سیاسەت تەرخان دەکاتو جگە لە سیاسەت هەرچی شتێتر هەیە لە ژیانی دەیکاتە دەرێ. مرۆڤێکی لەمجۆرەش مەحاڵەو مرۆڤێکی نامرۆڤانەیە. زۆرینەی خەڵك حەز بەوە ناکەن بەردەوام سەرقاڵی سیاسەتکردن بن. ئەوی پێی خۆشە کاندیدای هەبێتو دەنگی پێبدات، هاوکات برێك سانسۆریش لەسەر ئەو نوێنەرانە دابنێت کە هەڵیان دەبژێرێتو نوێنەرایەتی دەکەن. هەر ئەمەشە سیاسەت دەکات بەئەرکێکو هەرووەها ڕەوایەتی بەمەسەلەی دیموکراسی پەرلەمانیش دەبەخشێت.

ئەم حەقیقەتە سادەو بەڵگە نەویستە، خەونە قووڵاو وەهمە گەورەکەمانی کە خۆ بەڕێوەبردن بوو، تووشی شۆك کرد. ئێمە وەك مارکسیستێکی ئازاد لایەنگری خۆبەڕێوەبردنو شورا کرێکاریەکان بووین، بەپێچەوانەی کۆمۆنیستە دۆگماتیستو مارکسیستە دیسپۆتیزمیەکانەوە کە لەو کاتەدا لایەنگری پلانو بەرنامە بوون. ئێمە پێمان وابوو بەرنامەو پلانڕێژی جۆرێکی قێزەونە لە تۆتالیتاریزم، لەبەرئەوەی پێویستیەکانی کۆمەڵگا لە سەرەوەڕا دیاری دەکاتو جۆرو بڕی بەرهەمەکانیش بەسەر بەرهەمهێنەراندا دەسەپێنێت، بەبێ هیچ حسابکردنێك بۆ پشێویو نائارامی بازاڕ، بەڵام داخۆ خۆبەڕێوەبردن زۆر لە بەرنامەداڕشتنو پلانڕێژی ژیرانەترە؟ ئایا ئەویش پەنا ناباتە

بەرئەوەی بەرهەمهێنەرەکان دەستبکێشنەوەو دەستەبەرداری دەسەڵاتی بڕیاردان بن، بۆ ئەو بەڕێوەبەرانەی هەڵیان دەبژێرن؟ ئایا ئەوانیش لای خۆیانەوە وەك بیرۆکراسیەکان یاخود وەك سەرمایەدارەکان ڕەفتارناکەن، کاتێك وابەستەی یاساکانی کڕ بڕکێ‌و بازاڕدەبن؟ ئایا ئەمە گەڕانەوە نییە بۆ سەرەتا؟

ئەمە بەو مانایە نایەت کە هیچ ڕێگایەك بۆ سیاسەتی چەپگەرایی نەماوەتەوە، بەڵام لە کاتێکدا سیاسەت هەڵگری ئەو پێناسەیە بێت کە ئەگەرێکە بۆ گۆڕینی ژیان بەرەو باشتر، ئەوا دەبێت پڕۆژەی چەپگەرایی هاوتای واقیع‌و ئەو توانایانە بێت کە لە واقیعدا هەیە، بۆ ئەوەی لە ناوەوەیدا گۆڕان دروست بکات، بەبێ هیچ دابڕانێکی ڕادیکالانە کە گومانی تێدا نییە بەدەوری بازنەیەکی بەتاڵدا دەخولێتەوە. کەواتە پێویستە لە سەر چەپ لە یەك کاتدا هەم چاکسازی بێت‌و هەم واقیعی. لێرەدا مەبەستم چەپە نەك چەپی توندڕەو، چونکە تا هەنوکەش چەپی توندڕەو لەسەر ئەفسانەی تارووماركردنی کە پیتالیزم‌و ژێرەوژوورکردنی شێوازی بەرهەمهێنان دەژی‌و تا ئێستاش وەك سەردەمی "مارکس"، لەو ئایدیایەوە دەست پێدەکات کە سەرمایەداری دەستەبەری پێداویستییەکانی مرۆڤ ناکات‌و لە سایەی سستمێکیشدا داکۆکی لە جیاوازی کۆمەڵایەتی بکات، چاکسازیکردن کارێکی مەحاڵەو بێ پاساوە.

هەر بۆیە کورترینو خێراترین ڕێگا بۆ بەختەوەرکردنی مرۆڤو یەکسانیان، پاکتاوکردنو لە ناوبردنی سەرمایەداریە. ئەم ئەفسانەی لەناوبردنەش، گەورەترین وەهمە. یەکەم لەبەر ئەوەی سەرمایەداری هەمان سەرمایەداری ڕۆژگاری "مارکس" نییە، چونکە لەژێر فشاری خەباتی چینایەتیدا، سەرمایەداری ناچاربوو بەخۆیدا بچێتەوەو خۆی چاك بکات. بەجۆرێك ئایدیای شۆڕش، هێزو ڕەوایەتی خۆی پێکەوە لەدەستدا. دووەمیش لەبەرئەوەی شۆڕش بەرپانابێتو پاساوی بەرپابوونی نابێت، تەنها لەبارودۆخە کلۆمدراوو لە سایەی ئەو ستەمە سیاسییانەدا نەبێت کە هەموو شتێك سەرکوت دەکەنو تەواوی تواناکانی کۆمەڵگە بۆ بەرەوپێشبردنی شێوازی ژیانیانو شێوازی بەرهەمهێنان، بەهەندێك ڕیفۆرمی نیوەناچڵا پەکدەخەن. لە دۆخێکی ئاوەهادا ئەلتەرناتیڤێکی دیکە نییە، جگە لە هەڵدانەوەی سەرقاپی مەنجەڵەکە تا تواناو وزە کولهاتووەکان ئازادبن. بەهەرحاڵ لە کۆمەڵگە سەرمایەدارییە پێشکەوتووەکاندا، هیچ بوونێکی ئەو بارودۆخە کلۆمدراوە نەماوە. لە زۆربەی زۆری ئەو کۆمەڵگەیانەدا لە نێوان چەپڕەو ڕاستڕەوەکاندا ئاڵوێردی دەسەڵات دەکرێت، ئەمەش جۆرێك لە میکانیکیەتی دیالەکتیکی لە نێوان پرانسیپی ئابوری بازاڕی ئازاد، لەگەڵ داواکردنی یەکسانی کۆمەڵایەتیدا دروست دەکات.

ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە ئایدیۆلۆژیای چەپڕەوی ڕادیکالانە، هەموو ئیعتیبارێکی لەدەست داوە؟ ئەوەی ڕاستی بێت هێشتا کەمەکێك لە نرخو بەهای ماوەو لە هەندێك ناوەندیشدا وەك ئەفسانەیەکی مۆبێلیزەکردن ڕۆڵی خۆی دەگێڕێت، لە کاتێکدا مەرج نییە ئەفسانە بگۆڕێت بەواقیعو بۆشی ناکرێت، بەڵام ئەگەر بۆی کراو ئەو گۆڕانە روویدا، ئەوا جگە لە ماڵوێرانی هیچی دیکەی لێ شین نابێت.

ئەوەی ئەمڕۆکە پێویستە دیموکراسی زیاترە، نەك دابڕانی ڕادیکاڵانە. گومانی تێدانییە گواستنەوە لە دەسەڵاتێکەوە بۆ یەکێکی دی، دەبێتەمایەی هەڵپەساردنی پرۆسەی دیموکراسی. تەنانەت ئەگەر شۆڕشگێڕەکان، بەڕێگای دیموکراسیش دەسەڵاتیان گرتە دەست، لۆژیکو بیرووباوەڕە ڕادیکالیەکەیان وایان لێدەکات، بەڕێگای دیموکراسی دەستبەرداری نەبن.

شۆڕش لای ئەوان خێوێکە کە بەگۆچانە سیحریەکەی دەستی، تەواوی بارودۆخەکان ژێرەوژوور دەکاتو بەختەوەری بۆ مرۆڤایەتی دێنێت، ئەگەر نەشیانەوێتو حەزیشیان پێی نەبێت. ئەمەش بۆ خۆی بریتییە لە تۆوی تۆتالیتاریزم، لە هەموو ئایدیۆلۆژیایەکی شۆڕشگێڕانەدا. تاکە وانەیەك کە دەشێت لە تەواوی تۆتالیتاریزمەکانی سەدەی بیستەمەوە فێری ببین، ئەوەیە دەرگای دیموکراسی ڕاستەقینە چەند بەرتەسکیش بێت، نابێت بەناوی هیچ خەونێکی شۆڕشگێڕیەوە جارێکی دی کلۆم بدرێت).

لەناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی رابردوودا، ئەڵەمانیا توانی تۆزو غوباری دووەم جەنگی جیهانی لەخۆی بتەکێنێتو شاروو داموو دەزگاو دامەزراوەکانی ئاوەدان بکاتەوە. لەوکاتەدا نەوەی باوکەکان شانازیان بەبوونو ناسنامەی خۆیانەوە دەکردو راوێژکاری ئەڵەمانیاش "لۆدڤیگ ئیرهارد"، درووشمی (خۆشگوزەرانی بۆهەموان)ی بەرزرکردبووەوە. بەڵام لەناکاو نەوەی نوێ (گەنجان)، دەنگیان لێ هەڵبڕیو کەوتنە رەخنەگرتن لەنەوەی باوکانو دەسکەوتەکانیانو گاڵتەیان بەهەردوکیان دەهات. گەنجان کەوتنە بێزکردنەوەی لەنۆرمو بەهاکانی باوکانو خۆیان لێبەدوورگرتن.

باوکان کەگەیشتبوونە تەمەنی شەست ساڵیو راهاتبوون بەکورتکردنەوەی قژیانو تاشینی ردێنیانو پڕکێشی کردن لەبایەخدان بەپاکو تەمیزی خۆیانو رێزگرتن لەیاساکانی وڵات، نەیاندەتوانی لەرەخنەو گازندەکانی منداڵەکانیان حاڵی بن. ئەوان هەستیان بەشانازییەکی زۆر دەکرد، کاتێك لەرۆژانی پشوودا خێزانەکانیان لەگەڵ خۆیاندا دەبردە ئەو جێگایانەی بەسەر دەریای ئەدریاتیکدا دەیڕوانی.

